# لێکدانەوەی پێشەکی

# ((ابن الجزری))



دانانی

إحسان برهان الدين

الجامع للقراءات العشر من طريق الشاطبية والدرة

پێداچوونەوەو پێشەکی

مامۆستا دلێر گەرمیانی

الجامع للقراءات الاربع عشرة

د. دیاری أحمد

الجامع للقراءات العشر من طريق الشاطبية والدرة



چاپی دووەم

ناوی کتێب: لێکدانەوەی پێشەکی (إبن الجزري)
نووسینی: إحسان برهان الدين
نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیتەری نارین (محمد علی احمد)
تایپ: عمر نجم الدين
نۆرەی چاپ: دووهەم
تیراژ: ٢٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز ـ ١٤٣١ك
ژمارەی سپاردن: (٢٤١١)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

# لێکدانەوەی

# پێشەکی (إبن الجزري)

## دانانی

## إحسان برهان الدين

الجامع للقراءات العشر من طريق الشاطبية والدرة

### پێداچوونەوە و پێشەکی

مامۆستا دلێر گەرمیانی                    د.دیاری أحمد

# پێشەكی مامۆستا دلێر گەرمیانی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة و السلام على خير خلق الله محمد و على آله وصحبه أجمعين.

پاش خوێندنەوەو پێداچوونەوەم بەهەوڵی برای بەڕێزم مامۆستا إحسان برهان الدين، خۆشحاڵ بووم بەوەی كە بە یارمەتی خوای گەورە توانیبێتی كاری برایانی خۆی لە بواری جوان خوێندنەوەی قورئاندا زیاتر برازێنێتەوەو، ئەگەر بۆشاییەك لەو بوارەدا هەبووبێت بەیارمەتی خوا پڕی كردبێتەوە بە نووسینەكەی كە بە ڕای بەندە مامۆستایان و قوتابیانی ئەو زانستە پێویستیان بەو كتێبەیەو، بەهێزیی نووسینەكەی لە بەهێزیی هەڵبژاردنی ئەو مەتنە بەناوبانگەی (إبن الجزري)ە كە مەنهەجی كۆن و تازەی زۆرێك لە مەشایخی قیرائاتە، بەڕاستی برای بەڕێزم توانیویەتی مافی ئەو لێكدانەوەیە بدات بەشێوەیەك هیچ شتێكی گرنگی فەرامۆش نەكردووە و ئەوەندەش درێژی نەكردووەتەوە خوێنەر تووشی مەلەل و ماندووبوون بكات، هەروەها ئەوەندەش كورتی نەكردووەتەوە مافی بابەتەكانی نەدابێت و، ئەوەی شایەتی باسە ئەم نووسینەی ڕازاندووەتەوە و بەهێزی كردووە بە گەڕانەوە و پاڵپشت كردنی بابەتەكەی بە قسەی گەورە زانایانی ئەو زانستە، سوپاس بۆ خوا یەكەم كتێبێكە بە زمانی كوردی بە شێوەیەكی مەنهەجی لەسەر شێوازی نووسین و لێكدانەوەی زانایانی تەجوید ئەو مەتنەی لێكداوەتەوە، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە و بەردەوامیی پێ ببەخشێت بۆ زیاتر خزمەت كردنی قورئانی پیرۆز و ئەو زانستانەی پەیوەستن بە قورئانەوە... آمین.

**دلێر أحمد محمد**

الجامع للقراءات الأربع عشرة

## پێشەكی د.دیاری أحمد

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله ...

گومانی تێدا نیە كە بەرزترین و پیرۆزترین زانست زانستەكانی قورئانی پیرۆزە، كە وتەی خوای گەورەیە بۆ بەندەكانی.. لەوزانستانەش زانستی چاك خوێندنەوە (تجريد)ی قورئانە، كە بەلای زانایانەوە لەسەر هەموو موسڵمانێك واجبە قورئان بە (تجويد)ەوە بخوێنێتەوە.. ئەگەر چی شارەزابوون لەزانستە (نظري)یەكەشی لەسەر هەموویان واجب نەبێت (واتە فەرزی كیفایەیە) وەكو هەموو بەشەكانی تری زانست.

لەگەڵ ئەوەی مایەی فەخری گەلی كوردی موسڵمانە كە زانای ژمارە یەكی تەجوید و (حُجة) لە (قراءات)ی قورئاندا (شمس القرّاء إبن الجزري) رۆڵەی ئەم گەلە بەوەفایەیە، بۆ دیاریە بەنرخەكەی ئیسلام بۆ گەلەكەیان كە (قورئانە)[1]. مێژووی پیرۆزی پێشینمان بۆ خزمەتی قورئان پڕ نوورە و، مایەی شانازیە.. بەڵام لەسەدەكانی دوایدا –كەحەقی خۆیەتی ناوبنرێت بە سەدەكانی دواكەوتن– یان ڕاوەستان وقەتیسمان لە هەموو ئاستەكانی شارستانیەت (ماددی و ڕۆشنبیری) كە ئوممەتی ئیسلام، بە كوردیشەوە بەرەو دوواوە ڕۆیشتوون..

مێژوومان كەڵەپیاوی كوردی وەكو (إبن تيمية)ی تیاهەڵكەوتووە كەنموونەی تازەكەرەوەی (فقه) و (إجتهاد) و دەرچوون لە كۆتی (تقليد) ولاسایی كردنەوەی بێ بنەما بووە.. بەڵام لە سەدەكانی دواكەوتوویدا، بەناو پێشەوایانی دین خۆیان خەریك كردووە بە حاشیەی حاشیەكانەوە، بێ بایەخدان بە (دليل) كە دینەكەیان دینی

[1] بڕوانە: الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التأريخ / د.محمد علي الصويركي الكردي / ج٤، ص١٢٠.

(دليل)ە! بەهەمان شێوەش لە بواری قورئاندا لە ساڵەکانی بەرەودوا چووندا پشتگوێخستنێکی زۆر بەدی دەکرێت لە خزمەتی قورئاندا.. تەنانەت قورئان وای لێهاتبوو تەنها کتێبێکی پیرۆزبێت و لەناو پەڕۆدا دابنرێت بۆ موبارەکی و، نابێت باسی ڕاڤەی ئایەتەکان بکرێت نەك ئەو کەسە (کافر) بێت!! تەنانەت قوتابیانی شەرعیش (طلاّب العلم) لە کاتی قورئان خوێندندا هەڵەیەکی زۆردەکەن و ڕەچاوی بنەماکانی چاك خوێندنەوەی قورئان ناکرێت.

سوپاس بۆ خوا لەم دواییەدا، لەگەڵ دەستپێکردن وگەشەسەندنی ڕابوونی ئیسلامی و گەڕانەوەی ڕۆڵەکانی میللەت بەرەو گرنگیدان بە ئیسلام و، مامەڵەکردنی وەکو بەرنامەی ژیان و، هزر و ئەسڵی شارستانیەت.. هەروەکو چۆن گرنگی درا بە زانستەکانی تر، گرنگیش - کەم تا زۆر - دراوە بە زانستەکانی قورئان، بەڵام لەئاستی پێویستدا نەبووە، بەتایبەتی زانستی قیرائات و (ئەدا) و گرنگی دان بە سەنەدی نەپچڕاو بۆ سەرچاوەی ئەم قورئانە کە پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت).. چونکە ئەگەر زانستێك بشێت تەنها لە ڕێی خوێندنەوەی چەند کتێبێکەوە دەست بکەوێت، ئەوا چۆنێتی قورئان خوێندنەوە هەرگیز ناشێت، بەڵکو دەبێت لەڕێی مامۆستایەکی شارەزاوە بێت کەبنەماکانی خوێندنەوەی قورئانی بەڕاستەوخۆ لەدەمی مامۆستایەکەوە وەرگرتبێت، بەو شێوەیە تا دەگاتە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)..

لەگەڵ ئەوەی بەزمانی کوردی چەند کتێبێك دانراوە دەربارەی زانستی تەجوید، بەڵام ئەوە بەدی دەکرێت، لە زۆریاندا، کە نوسەرەکەی خۆی شارەزاییەکی تەواوی نەبێت لە ماددە زانستیەکە و، پراکتیکیشی زۆر نەبێت.. لەوە دەچێت هەر وەرگێڕانێکی دانراوە عەرەبیەکان بووبێت! لەگەڵ ئەوەی کە سوودیشیان زۆرە.. بەڵام کەم و کوڕییان پێوەدیارە، بەپێچەوانەی ئەم کتێبەی بەردەستمان کە برای بەڕێز کاك إحسان نوسیویەتی.. کە خۆی شارەزاییەکی باشی هەیە لە خوێندنەوەی قورئان و،

خاوەنی سەنەدی نەپچڕاوە و، لە دەمی شارەزایانەوە قورئانی وەرگرتووە.. بۆیە کتێبەکەی لەسەر بناغەیەکی پتەو نوسراوە و زانیاری زۆری تێدایە.. ئەمە و جگە لەوەی کە زۆر سەرچاوەی گرنگ و متمانە پێکراوی بەکارهێناوە لە بابەتەکەدا.

لە ڕاستیدا ئەم کتێبە زیاتر بۆ شارەزایان و قوتابیانی شەرعیە، بەڵام هەموو ڕۆشنبیرێك سوودی خۆی لێ وەردەگرێت، دەتوانم بڵێم تا ئێستا بە زمانی کوردی نموونەی ئەم دانراوە نیە.. بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت بە دروستی قورئان لای مامۆستایەکی شارەزا خەتم بکەن، زۆر گرنگە بگەڕێنەوە بۆی..

داوکارم لە خوای گەورە ئەم کارە جوانە لە برای نووسەر وەربگرێت و بیکاتە توێشووی قیامەتی.

د. دیاری احمد اسماعیل

الجامع للقراءات العشر من طریق الشاطبیة والدرّة

ooo

# پێشەکی نووسەر

الحمد لله الذي خلق السماوات والأرض وجعل الظلمات والنور ثم الذين كفروا بربهم يعدلون، والصلاة والسلام على الرحمة المهداة، سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأتباعه و أحبابه أجمعين.

خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی قورئان بەجوانی و دروستی دەخوێنێتەوە و، ساتەکانی شەو و ڕۆژی لەگەڵدا بەسەر دەبات، چونکە قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێت بە تکاکار بۆ خوێنەرانی، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ان القرآن يشفع يوم القيامة في اصحابه...)[1].

لەڕاستیدا ژیان لەسایەی قورئاندا–وەکو یەکێك لە خواناسان دەفەرموێت–: نیعمەتێکی گەورەیە، نیعمەتێکە کەسێك نەیچەشتبێت نازانێت چۆنە، نیعمەتێکە تەمەن پیرۆز دەکات و مرۆڤ لە هەموو پیسیەك پاراو دەکاتەوە.

یەکەم پەیامی قورئانیش بۆ مرۆڤایەتی داوای فێربوونی زانست بوو (إقرأ)، زانستیش نیە مەزنتر لەزانستەکانی قورئانی پیرۆز، چونکە–ڕاستەوخۆ–پەیوەندنی بە فەرموودەی پەروەردگارەوە هەیە، یەکێك لە گرنگترین زانستەکانی قورئانیش زانستی تەجوید و شێوازەکانی خوێندنەوەی قورئانە بەپێی ئەو بنچینە و بنەمایانەی گەورە زانایانی ئەم زانستە دیاریان کردووە.

بەڵام ئەوەی کە جێگەی داخە، ئەم زانستە مەزنە پشکێکی کەمی بەرکەوتووە لەبایەخدانی مسوڵمانان لەم وڵاتەی خۆمان و بەتایبەتی مەبەستم کوردستانە، ئەوەش

---

[1] أخرجه مسلم ١/٥٥٣، و أحمد ٢٥٤، ٢٥٧، ٥/٢٤٩، و الطبراني في الكبير ١٣٩-٥/٣٨، البيهقي في السنن الكبرى ٢/٣٩٥.

کەمتەرخەمیەکی بێ پاساوە، چونکە بوارێك نیە شایانی گرنگی پێدان بێت ئەوەندەی قورئانی پیرۆز، فەرمانی خوای گەورەش لەم بارەوە ڕوونترە لە تیشکی خۆر لە ناوەڕاستی ڕۆژدا کە **فەرموویەتی:** (ورتل القرآن ترتيلا).

ئەوە فەرمانێکی خواییە، هاوەڵان بە باشترین شێوە لە خۆیاندا بەرجەستەیان کردبوو، بەو شێوازەی کە لە پێغەمبەر (ﷺ) یان وەرگرتبوو. فێربوونی قورئانیش بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بەهەوڵدان و کۆشش دەبێت، چونکە بەدەست هێنانی ئەو زانستە ڕادەوەستێت لەسەر لایەنە تیۆری و کردەیەکەی پێکەوە، بەتایبەتی بۆئەوانەی کە دەیانەوێت ڕۆڵی مامۆستایی و فێرکردنی موسوڵمانان ببینن، پێویستە لەسەریان سەرباری ئەوەی بەجوانترین شێوە پیتەکانی قورئان دەربڕن، بشگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە متمانە پێکراوەکانی ئەم زانستە-بەتایبەتی سەرچاوە دێرینەکان- چونکە هەموو زانا هاوچەرخەکان زانستەکانیان لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، لێرەشەوە گرنگی زمانی عەرەبی دەردەکەوێت، چونکە زمانی ئاینیی ئێمەی موسوڵمانانە، واتە ئامرازی تێگەیشتنمانە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها بۆ تێگەیشتن لەو گەنجینە بە نرخانەی کە زانایان بۆیان بەجێهێشتووین، وا زەمانەش جارێکی تر خۆی دووبارە دەکاتەوە و، لەژێر پاساوی جیاجیا هەڵمەتی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەچڕی لەدژی ئەم زمانە ئەنجام دەدرێت، بەهیوای پەیدابوونی نەوەیەك لەداهاتوودا تێگەیشتنی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەلایانەوە قورستربێت لە سەرکەوتنی چیایەکی سەخت، ئەوەش لێپرسراوێتیەکی مێژوویە دەکەوێتە سەر ئەستۆی موسوڵمانانی ئەم سەردەمە، خوای گەورەش بێ نیازە لەو هەوڵانەی ئێمە و، خۆی بەڵێنی پاراستنی قورئانەکەی داوە، بەڵام تاقیمان دەکاتەوە تاکو چ ئەندازەیەك پەرۆشین لەسەر ئاینەکەمان، مەخابن سەرەتای بەرووبوومی ئەو هەوڵانەش دەرکەوتوون لە نەوەی تازە پێگەیشتوودا و، یەکێکیش لە دیاردەکانی گرنگی نەدان نەشارەزاییە لە قورئان خوێندندا، ئەم مەترسیەش کە

لێرەدا دەیخەمە ڕوو زیاتر مەبەستم لەڕاست خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزە ئەگینا-سوپاس بۆخوا-هەوڵی مامۆستایان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامی و سەرجەم ئەو خزمەتانەی ئەمڕۆ بەئاینی ئیسلام پێشکەش دەکرێت، هەموو ئەمانە غەریبی ئیسلامیان لابردووە و بووژانەوەیەکی بەرچاو وەدیدەکرێت لەنێو موسوڵمانانی هەرێمدا.

لێرەشەوە داواکارم لە فێرخوازانی زانست-بەتایبەتی قورئانی پیرۆز-ڕێبازی وەرگرتنی زانست لەڕێگەی سەنەدەوە زیندوو بکەنەوە، چونکە ئەوە ڕێبازێکی متمانە پێکراوە بۆ وەرگرتن و فێربوون.

منیش فەزڵ و چاکەی خوای گەورە بەسەرمەوەیە بەوەی هەلی خوێندنەوەی یەك خەتمەی بۆ ڕەخساندم بە قیرائەتی عاصم لەسەر هەردوو ڕیوایەتی (شعبة) و (حفص) لەسەر دەستی مامۆستامان (مامۆستا دلێر گەرمیانی)-دواتریش (أصول)ی دە پێشەوا گەورەکانم لەلای خوێند و قۆناغی (الجمع الصغیر)یشم تەواو کردو ئێستا لە (الجمع الکبیر)دا گەیشتوومەتە جوزئی هەشتەم بەسەنەدی نەپچڕاو بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەش دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەم زانستە گرنگەی بۆ والاّ کردم و، یەکێك لەو کتێبە بە پێز و بەنرخانەی خوێندمەوە و، بە وانە وتمەوە چەند جارێك، کتێبی (المقدمة الجزریة)ی (إبن الجزري) بوو ڕەحمەتی خوای لێبێت، ئەم کتێبە وەکو پێناسەمان کردووە لە سەرەتای ئەم ڕاڤەکردنە یەکێکە لە باشترین ئەو کتێبانەی لەبواری زانستی تەجوید و بنەماکانی خوێندنەوەی قورئاندا نووسراون بەشێوەی هۆنراوە، چونکە نووسەرەکەی پێشەوایەکی ناوداری هەرەگەورەیە، کە هەموان بێ ڕاجیایی کۆکن لەسەر پێشەوایەتی ئەو، بێگومان زانستیش-هەر زانستێك بێت-لەسەرچاوەکەیەوە وەربگیردرێت باشترە، هەروەکو چۆن ئاوخواردنەوە لە سەرچاوەی سازگار باشتر و خۆشترە لەو شوێنانەی دوورن لە سەرچاوەوە.

بۆیە پشت بە خوای گەورەو، لەژێر ڕووناکی کۆمەڵێك لێکدانەوەی زانایانی کۆن و هاوچەرخ، هەڵسام بە نووسینی شەرحێك بۆ ئەم کتێبە، هاندەریشم–پاش ڕەزامەندی پەروەردگارم–ئەوەبوو بینیم موسوڵمانان بایەخی پێوستیان بەم زانستە نەداوە و، تەنانەت خاوەن بڕوانامە و ڕۆشنبیرەکانیش هەر بەجوانی نازانن قورئان بخوێننەوە و، لە زۆربەی حوکمەکانی بێ ئاگان، جگە لەوەش هاندەرێکی بەهێزی ترم هەبوو کەبریتی بوو لەوەی تاکو ئێستا ئەم کتێبە بەباشی نەناسراوە لەنێو مسوڵمانانی کورد و کەس هیچ لێکدانەوەیەکی بۆنەکردووە کە چاپ کرابێت.

شایانی باسیشە کە ئەم کتێبە و، هیچ کتێبێکی تر لەم زانستە، قەرەبووی هەبوونی مامۆستا ناکاتەوە بۆ فێرکردنی فێرخواز، چونکە ئەگەر بگونجێت هەر زانستێك لە ڕێگەی کتێبەوە وەربگیردرێت، زانستی تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان هەرگیز بەتەواوی بەدەست ناخرێت بەبێ مامۆستایەکی لێهاتوو، ئەوپەڕی هیواشم لەم کتێبە ئەوەیە سەرچاوەیەکی فێرکردن بێت بۆ مامۆستایانی قورئان و، بابەتێکی هاندەر بێت بۆ قوتابیانی زانست بیخوێننەوە و سوودی لێوەربگرن بە هاوکاری کەسانی لەخۆیان شارەزاتر.

لەئەزموونی خۆیشمەوە لەکاتی فێربوونی قورئان بەپێی بنەماو بنچینەکانی دەڵێم: ئەی قوتابی زانست و جوان خوێندنەوەی قورئان، پێش ئەوەی خەتمەیەکی تەواو بخوێنیت لەلای مامۆستایەکی لێهاتوو، گوێگرتنت بۆ قورئان زۆر جیاوازە لەگەڵ پێش تەواو کردنی خەتمەکە، تۆ پێشتر گوێت لە ئایەتێك دەگرت بەسەریەکەوە، بەڵام ئێستا پیت پیت بەگوێتدا تێدەپەڕێت، چونکە مەخرەج و سیفەتی پیتەکانی دەزانیت، بۆیە نزم کردنەوەی پیتی بەرز و پێچەوانەکەی، قەلقەلە پێنەکردنی پیتەکانی قەلقەلە و پێچەوانەکەی، ڕانەوەستان لەسەر پیتەکانی (لن عمر)، تێپەڕبوون بەسەر پیتەکانی (صفیر) بەبێ پێدانی ئەو سیفەتە، کورت کردنەوەی مینگە و مەددەکان لەئاستی خۆیان و شتی تر، هەموو ئەمانە ئێستا سەرنجت ڕادەکێشن، پێیان دەزانیت

کەهەڵەن، من دەستەبەری ئەوەم بۆ هەر براو خوشکێکی موسوڵمانی قورئان دۆست، کە ئەگەر مەخرەج و سیفەتەکان شارەزا بوو و، خەتمەیەکی قورئانی بە درووستی خوێند لەسەر دەستی مامۆستایەکی کارامە هەست بە حاڵەتێکی تازە دەکات لە خۆیدا، کە هەرگیز پێشتر هەستی پێنەکردووە، شادیەکە لەوانەیە دیاری خوای گەورە بێت بۆ ئەو کەسەی بەشێك لەساتەکانی تەمەنی تەرخان دەکات بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان.

واشنەزانی لێهاتوویی لە بنەماکانی تەجوید و ڕاست خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز مەسەلەیەکی ڕواڵەتیە و، کاریگەری زۆری نیە، نەخێر، بەڵکو وادەزانم ئەوە (یەکێکە) لە هۆکارەکانی تێنەگەیشتن لە قورئان و (تدبر) نەکردنی، ئاخر کەسێك چۆن سوود لە مەزنترین سورەتی قورئان (الفاتحة) وەربگرێت کە بە پەلە بیخوێنێتەوە وەکو ئەوەی گورگێکی بەدواوە بێت و، پیتەکانی تێکەڵ و پێکەڵ بکات، یان (آیة الکرسي) هەروەها ئایەتەکانی تر، ئەو پەلەپەل کردنە و تێکەڵ کردنی وشەکان بەسەر زماندا بەو شێوازە، ڕێگرە لە سوود وەرگرتن و تێڕامان لە واتاکانیدا.

چی بێت لەقورئان باشتر، ئادەمیزاد تەمەنی تێدا بەسەر بەرێت، ئێمە بەو شێوەیەین وەکو حەسەنی بەسری ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد تۆ بریتیت لە چەند ڕۆژانێك، جا کە ڕۆژێکت تێپەڕی وەکو ئەوەیە هەندێکت لەنێو چووبێت، ئەگەر کەسێکیش هەندێکی لەنێو چوو، بێگومان زۆر نابات و بەجارێك تیا دەچێت.

کتێبی خواش لەپێشترە لە هەموو زانست و بوارێکی تر بۆ بایەخ پێدان، ئەو ساتانەش لەگەڵ فێربوون و تێگەیشتن و لەبەرکردنی ئایەتەکانیدا بەسەر دەچێت ساتگەلێکی پیرۆزن و قورسی تەرازووی ڕۆژی قیامەتن (إنشاءالله).

لەم نووسینەشدا ئەوەندەم بەسە توانیبێتم ئەم بابەتە بوروژێنم بۆ مامۆستایان و نووسەران کە هەوڵێکی جددی دەست پێبکەن بۆ ڕافەکردن و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕانی

ئەو هەموو سەرچاوانەی کە خوێنەری مسوڵمانی کورد نەك هەر لێیان سوودمەند نەبوونە، بەڵکو ناویشیان نەبیستووە، ئەوەش زیانێکی گەورەیە، چونکە لەڕاستیدا گەورە زانایان و کەڵەپیاوانی ئەم بابەتە مەزنە نووسین و شوێنەواری ناوازەیان بۆ بەجێهێشتووین، گەلی کورد لەژێر جۆرەها پاساودا لێی بێبەش بووە، منیش بەپشتیوانی خوای پەروەردگار چەندین سەرچاوەی ترم داناوە کاریان لەسەر بکەم ئەگەر تەمەن دەرفەتی تێدا مابێت.

دەپاڕێمەوە لەخوای گەورە و دەڵێم:

ئەی چاکترین کەسێك گوێ لەنزاو پاڕانەوەی بەندەکانی دەگرێت، بمپارێزە لەوەی لەم نووسینەم مەبەستم ناوبانگ دەرکردن و ڕووپامایی بێت، بۆئەوەی کردەوەم پووچەڵ نەبێت و پاداشتم بە زایە نەچێت، لاسایی پێشەوای گەورە (الشاطبي)یش دەکەمەوە، دەڵێم:

وناديت اللهم يا خير سامع      أعذني من التسميع قولا و مفعلا

إليك يدي منك الأيادي تمدها      أجرني فلا أجري بجور فاخطلا [١]

لەکۆتایشدا دەڵێم:

لەم لێکدانەوە کورتەدا گەڕاومەتەوە بۆ زۆرێك لە کتێبەکانی تەجوید و شەرحی (الجزرية) لە کۆن و نوێدا، ئەم بوارەش بوارێك نیە لەخۆمەوە قسەم تێدا کردبێت، بەڵکو هەرچیم نووسیوە هەر گواستنەوە بووە بۆ قسەی زانایان لەمەڕ ڕاڤەکردنی دێڕەکانی هۆنراوەکە، بەڵام ئەزموونی وانە وتنەوەی تەجوید و، ڕاڤەکردنی پێشەکی (الجزرية) هەلی کەڵك وەرگرتنی بۆ ڕەخساندم لەگەڵێك لەو کتێب و سەرچاوانەی لەم

---

١ بڕوانە: الوافي في شرح الشاطبية / عبد الفتاح القاضي/ ٢٧-٢٨.

بارەوە نووسراون و، بە گوێرەی توانای خۆم هەوڵم داوە ئەو سوودانە بە خوێنەرم بگەیەنم.

جا ئەگەر تووشی هەڵەو نەپێکان بوویێتم لە جێگەیەکی کتێبەکەو، کەسێك بەرچاوی ڕوون کردمەوە و هەڵەیەکی بۆ ڕاست کردمەوە، بەئەو پەڕی سنگ فراوانیەوە وەریدەگرم و، لەهەڵەکەم پاشگەز دەبمەوە، چونکە لەکۆتاییدا من زیاتر نیم لە ئادەمیزادێك کە قابیلی هەڵەکردنە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهدُ ألاّ إله إلاّ أنت أستغفرك و أتوب أليك.

باوکی موحەممەد / إحسان برهان الدين

کەلار ١٩/٨/٢٠١٠

ihsanburhan@yahoo.co.uk

## کورتەیەک دەربارەی ژیاننامەی (إبن الجزري)

ئەبولخەیر شەمسەددین موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی یوسف، عومەری، دیمەشقی، شیرازی، ناسراو بە (إبن الجزري)[١].

لە شەوی شەممە، لە پاش نوێژی تەراویح لە بیست و پێنجی ڕەمەزانی ساڵی (٧٥١)ی کۆچی لە گەڕەکی (بين السورين) لە دیمەشق لە دایك بووە.

باوکی بازرگان بوو، چل ساڵ بوو منداڵی نەدەبوو، کاتێك ڕۆیشت بۆ حەج لەلای ئاوی زەمزەمدا پاڕایەوە لە خوای گەورە کە کوڕێکی زانای پێببەخشێت.

ئەم باوکە بازرگانە پیاوێکی خواناس و زانست پەروەر بوو، قورئانی مەزنڕادەگرت و، لە لای مامۆستایانی ناودار وەریدەگرت، خودی (إبن الجزري) لە باسکردنی ژیاننامەی (الحسن السروجي) مامۆستایدا فەرموویەتی[٢]:

(مامۆستای من و مامۆستای باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێت، باوکمی فێری قورئان خوێندن کرد).

---

١ (جزيرة إبن عمر): ناوچەیەکە لەسەر سنوری سوریا – تورکیا، لەئەو سەری باکوری موسڵ، ئەم دورگەیە ڕوباری دیجلە لە یەك لاوە دەورەی داوە بەشێوەی مانگ، بەڵام دواتر کەندڕێك لەلایەکانی ترەوە دروست کراو، ئاستێکی لەسەر دروست کراو، هەربۆیە ئاو چواردەوری ناوچەکەی دا، کەسانێکی زۆریش بەو ناوچەیە ناسراون وەکو لە کتێبی (معجم الأدباء ١/١٦٠ هـ) و (کفاية الالمعي / ٨٥) باسکراون.

٢ بڕوانە: غاية النهاية ١/٢٤٩.

(إبن الجزري) جگە لە زانستی قورئان و لەبەرکردنی گوێی لە فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) دەگرت لە گەورە زانایانەوە، وەکو هاوەڵانی (الفخر ابن البخاري) و کەسانی تر لە دیمەشق، ئیجازەشی لە گەورە زانایانی وەرگرت، وەکو خاڵی بەساڵاچووی باپیری (محمد بن إسماعیل الخبان)، پاشان دەستی کرد بە کۆکردنەوەی شێوەکانی خوێندنەوەی قورئان (القراءات)، لەسەر دەستی زانایانی شام وەکو: (عبدالوهاب بن السلار) و (أحمد الطحان) و (أحمد رجب) لەنێوان ساڵی ٧٦٦-٧٦٧ ك، حەوت خوێندنەوەکەشی لە (إبراهیم الحموي) وەرگرت و، دواتر لەسەر دەستی (إبن اللبان) هەموو خوێندنەوەکانی تەواو کرد.

پاشان ئارەزووی گەشتی پەیدا کرد لەپێناو بەدەست هێنانی ئیسناد بەرزی و، زۆرتر کارامەبوون، هەربۆیە ڕووی کردە وڵاتی پیرۆزی حیجاز لەساڵی ٧٦٨ ك، لەوێیش پەیوەندی کرد بە وتارخوێن و پێشنوێژی مەدینە (محمد بن عبدالله الخطیب)و قیرائاتی لێوەرگرت، لەسەر کتێبی (الكافي) و (التیسیر) پاشان گەڕایەوە بۆ دیمەشق و درێژەی بە خوێندنەکانیدا لەلای (إبن السلار) و، چەند زانایەکی تر.

لەپاش ئەوە ئارەزووی گەشت کردنی کرد بەرەو ئەندەلوس بەمەبەستی خوێندنی زانست لەلای (محمد بن یوسف الاندلسي) بەڵام باوکی ڕێگەی نەدا، هەروەها حەزی کرد بچێتە (کرك) بەڵام حەزەکەی بەدی نەهات، پاشان بڕیاری دا بچێت بۆ قاهیرە لە ساڵی ٧٦٩ ك، لەوێ زانستی قورئان خوێندنی لە گەورە زانایانی وەرگرت، وەکو: (محمد بن الصایغ) و (عبدالرحمن البغدادي) و (ابی بکر بن الجندي) لەپاش وەرگرتنی ئیجازە گەڕایەوە بۆ دیمەشق، بەڵام پاش مانەوەیەکی کەم گەڕایەوە بۆ قاهیرە لەساڵی ٧٧١ ك، بۆئەوەی جارێکی تر لەسەر چەند کتێبێکی قورئان شێوەکانی خوێندنەوەی قورئان وەربگرێت، هەروەها بۆ وەرگرتنی زانستی فەرموودەش لەسەر دەستی ئەوانەی مابوون لە قوتابیەکانی (الدمیاطي) و

(الابرقوهي) و، زانایانی تر، هەروەها زانستی فیقهیشی وەرگرت لەسەر مەزهەبی پێشەوا شافیعی لەبارنەی مامۆستا (عبدالرحیم الاسنوي) و زانای تر.

پاشان قاهیرەی بەجێهێشت بەرەو دیمەشق و، هەموو قیراثاتەكانی كۆكردەوە لەسەر دەستی (القاضي احمد الكفري)، پاشان خێرا جارێكی تر گەڕایەوە بۆ قاهیرە، لەساڵی ٧٧٨ ك، دەستی كرد بەخوێندن لەلای (الضیاء القزویني) و زانای تر لەزانستی (الاصول) و (المعاني) و (البیان)، هەروەها گەشتی كرد بەرەو شاری ئیسكەندەریە بۆئەوەی قیراثات بەكۆكراوەیی وەربگرێت لەسەر دەستی (عبدالوهاب القروي الاسكندري)، بەڵام لەوێ هەستی كرد سۆزی دەخروشێت بۆ شارەكەی خۆی، بۆیە–لەپاش وەرگرتنی مۆڵەت و بڕوانامەی زانستی لەسەر دەستی مامۆستایانی– گەڕایەوە بۆ دیمەشق وەكو زانایەكی گەورە لە چەندین زانستدا لەسەرووی هەموشیانەوە لە زانستی (القراءات) و(الحدیث) و (الفقه).

لە دیمەشق ئەستێرەی (إبن الجزري) درەوشایەوە و، ناوبانگی پەیدا كرد و، (إبن كثیر)ی زانا و لێكدەرەوەی قورئانیش ئیجازەی "فتوا"دانی پێبەخشی لەساڵی ٧٧٤ ك، ئینجا بەمەبەستی قورئان وتنەوە بە فێرخوازانی زانست و، بۆماوەی چەندین ساڵ لە مزگەوتی (الأموي) دانیشت و لێپرسراوێتی قوتابخانەی (العادلیة)شی گرتە ئەستۆ، هەروەها بوو بە مامۆستای (دار الحدیث) لە (الأشرفیة الكبری) و، بوو بە لێپرسراوی قوتابخانەی گەورە لە (تربة أم صالح)، لەپاش لە دونیا دەرچوونی (إبن السلار) ی مامۆستای لەساڵی ٧٨٢ ك، ئەمەش لەكاتێكدا بو كە زانایانی گەورە وەكو: (الشهاب ابن الحجي) و كەسانی تر لە ژیاندا بوون،چەندین ئەركی زانستی دیكەشی لە ئەستۆ گرت، هەروەها قوتابخانەیەكیشی دروست كرد بۆ فێركردنی قورئان و خۆی بوو بە مامۆستای، پاشان بەباشی زانی دەست بكات بە بڵاوكردنەوەی زانست و گەشت بكات لەپێناویدا، پاش ئەوەی وەكو قوتابی گەشتی دەكرد، ئەمجارە وەكو زانایەك، بۆیە لەساڵی ٧٧٨ ك گەشتی كرد بۆ میسر بەهاوڕێیەتی موحەممەدی كوڕی، لەپاش

ساڵێك لە میسر دەرچوو بەڵام لەساڵی ٧٩٨ ك جارێکی تر گەڕایەوە میسر و چووە ئیسکەندەریە و، وڵاتی ڕۆم، کاتێك گەشتە شاری برۆسە ڕێزی زۆری لێنرا لەلایەن سوڵتانی عوسمانی "بایەزید"ەوە و، حەوت ساڵ لەوێ مایەوە سەرقاڵی زانست و، وتنەوەی (قراءات) و، زانستەکانی قورئان و فەرموودە بوو تێیدا.

قوتابیەکی زۆری هەبوو لەوێ، لەپاش کۆچی دوایی سوڵتان بایەزید، (إبن الجزري)لە ساڵی ٨٠٥ ك ڕووی کردە (بلاد ماوراء النهر) و، لەوێ چوو بۆ شاری (کش)و دواتر چوو بۆ (سمرقند) و، تەیمورلەنگ ڕێزی زۆری لێ گرت، لەساڵی ٨٠٧ ك بەرەو خۆراسان بەڕێکەوت و، ڕۆشتە (هراة) و (یزد) و دواتر لە ئەسفەهان مایەوە، تاکو ڕەمەزانی ساڵی ٨٠٨ ك و، ئینجا ڕۆشتە شاری شیراز، سەرانی دەسەڵات لە شیراز وابەستەیان کرد کە لەوێ بمێنێتەوە و، کردیشیان بە دادوەری شیراز و دەوروبەری، چواردەساڵ لەوێ مایەوە، قوتابخانەیەکی قورئانی لەوێ دروستکرد و، قوتابی زۆری لەدەور کۆبوویەوە.

لەساڵی ٨٢١ ك ڕووی کردە عێراق، لە بەسرە نیشتەجێ بوو بۆ قورئان ووتنەوە و، فێرکردن، هەربۆیە قوتابی زۆری لەدەور کۆبوویەوە و، لە شیرازەوە (طاهر بن عزیز الأصبهاني) خۆی گەیاندە لای (إبن الجزري) مامۆستای و خەتمەیەکی تەواوی بە (القراءات العشرة) لەلا تەواو کرد و، دەستی کر بە خەتمەیەکی تر بەڵام تەواوی نەکرد.

لەساڵی دواتر ڕووی کردە شاری مەدینە و،بەلای گوندی عونەیزەدا تێپەڕی بەهاوڕێیەتی (معین الدین بن عبدالله قاضي کازرون)ی قوتابی خۆی، پاش دوورکەوتنەوەیان لەو گوندە عەرەبە بیابان نشینەکان هێرشیان بۆ هێنان، بەڵام خوای گەورە ڕزگاری کردن لە دەستیان و، هەڵاتنەوە بەدەستی بەتاڵەوە بەرەو عونەیزە، چونکە هەرچیان پێبوو بەتاڵانی برا، لەو دەڤەرەش (إبن الجزري) هۆنراوەی (الدرة المضیة في القراءات الثلاث المتممة للعشرة)[1]ی نووسی، کەلەکۆتاییەکەیدا ئامارە دەکات بۆ ڕووداوی دەستدرێژی کردنەسەریاندا و، دەفەرموێت:

---

[1] (الدرة): بریتیە لە قیرائەتی ئەبوجەعفەر و یەعقوب و خەلەفی دەیەم بەشێوەی هۆنراوە دانەر ئوصولی ئەم سێ قیرائەتەی تێدا کۆکردووەتەوە (أُصول و فرش) ((م. دلێر گەرمیانی)).

غريبة اوطان بنجد نظمتها | و عظم اشتغال البال وافر وكيف لا
صُددت عن البيت الحرام وزوري | المقام الشريف المصطفى اشرف الملا
وطوقني الأعراب بالليل غفلة | فما تركوا شيئا وكدت لأقتلا
فادركني اللطف الخفي وردّني | عُنيزة حتى جاءني من تكفلا
بحملي و ايصالي لطيبة آمنا | فيارب بلغني مرادي وسهلا[1]

لە عونەیزە (قاضي) ناوبراو خەتمەیەکی بە خوێندنەوەی ئەبوجەعفەر لەلای (ابن الجزري) خوێند و لە مەدینە تەواوی کرد و، لەوێیش پێشنوێژی حەرەمی مەدینەش دەستی کرد بە خوێندن لەلای[2].

کاتێك وادەی حەج کردن نزیك بوویەوە بۆ ئەو مەبەستە خۆی سازدا و، پاشان لەهەردوو حەرەمی مەککە و مەدینە مایەوە بۆ وانە وتنەوە و، دانانی کتێب، دواتر دەرچوو بەرەو عێراق و، لەساڵی ٧٢٦ ك جارێکی تر گەڕایەوە بۆ حەج، پاش تەواو بوونی حەج ڕۆیشت بەرەو قاهیرە و، لەوێ چاوی بە ئەحمەدی کوڕی کەوت و، هەروەها لەگەڵ سوڵتان ئەشرەفدا کۆبوویەوە و ڕێزی زۆری لێی گرت[3]، ئەوکاتەش کەچاوی بە ئەحمەدی کوڕی کەوت بیست ساڵبوو یەکتریان نەبینیبوو، بۆیە نامەی بۆنووسیبوو لەولاتی ڕۆمەوە ئامادە بێت و، دەڕۆژ پێکەوە مانەوە. لەساڵی حەجی داهاتوودا ڕووی کردە مەککە و، یەك مانگ تێیدا مایەوە ئینجا دەرچوو بەرەو یەمەن لەڕێگەی دەریاوە، بەمەبەستی فێرکردن و قورئان وتنەوە و بازرگانی کردن، لەوێ خەڵکەکە پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر نزیك بوونەوە و خوێندن لەلای، چونکە ئەوان پێشتر کتێبی (الحصن الحصين)ی (إبن الجزري) یان خوێندبوویەوە، (إبن الجزري)

---

١ بڕوانە: کۆتایی پەراوێزی (التسهيل لقراءات التنزيل).

٢ بڕوانە: غاية النهاية / ٢/٢٥١ .

٣ بڕوانە: البدر الطالع / ٢/٢٥٨ .

لەناویاندا مایەوە تاکو وادەی حەج لە ساڵی داهاتوودا و، لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی بەڕێکەوتن بەرەو میسر، چەند مانگێك لەوێ مانەوە و، لێی دەرچوون لە (جمادى الآخرة)ی ساڵی ٨٢٩ ك بەرەو دیمەشق و لەوێ لەیەکتر جیابوونەوە؛ کوڕەکەی بەرەو وڵاتی ڕۆم و خۆی بەرەو شیراز، هەر لەوێیش مایەوە لەسەر ئەو حاڵە لە فێرکردن و وتنەوەی قورئان تاکو لەڕۆژی هەینی ٥ / ربيع الأول / ٨٣٣ ك کۆچی دوایی کرد، کاتێك خەڵکی هەواڵی مردنیان بیست، لەهەموو لایەکەوە کۆبوونەوە و، بەخەڵك و کاربەدەستانەوە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ هەڵگرتنی تەرمەکەی و، هەر لەو قوتابخانەی کە دایمەزراندبوو لەشیراز نێژرا.

نووسین و کتێبەکانی (إبن الجزري):

(إبن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێبێت نووسینی زۆری هەیە لە هەموو بابەتەکانی زانست لە ئیسلامدا بەتایبەتی زانستی (القراءات) ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە (٨٠) کتێب، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها باسی چەند کتێبێکی بەناوبانگی دەکەین وەکو: — تحبير التيسير في القراءات العشر.

- تقريب النشر في القراءات العشر.
- التمهيد في علم التجويد.
- الدرة المضية في قراءات الأئمة الثلاثة المرضية.
- طيبة النشر في القراءات العشر.
- غاية النهاية في أسماء رجال القراءات.
- المقدمة الجزرية.
- منجد المقرئين و مرشد الطالبين.

- النشر في القراءات العشر[١].

## پێناسەیەك بۆ (المقدمة الجزرية)

پێشەکی (الجزرية) هۆنراوەیەکە لە دانانی (إبن الجزري) لەسەر بەحری (الرجز) بریتیە لە سەدوحەوت کۆپلە (دێڕ)، هەموو بابەتە سەرەکیەکانی زانستی تەجویدی لەخۆگرتووە، ڕێکخستنیشی بۆ بابەتەکان لەسەر بنەمایەکی (منطق)ی ڕوون دامەزراندووە، سەرەتا بەپێشەکیەکانی تەجوید دەستپێدەکات و، ئینجا باسی مەخرەج و سیفەتی پیتەکان دەکات و، دواتر هەندێ حوکمی تایبەت باس

دەکات بەو پێشەکیانەوە، وەکو یاساکانی ڕاوەستان و،شێوازی نووسینی قورئان و، ڕاوەستان لەسەر کۆتایی وشەکان.

وادیارە (إبن الجزري) ناوونیشانی لاوەکی لەنێوان دێڕەکانی هۆنراوەکەیدا دانەناوە، وەکو دەردەکەوێت لەکۆنترین دەستنووسەکانی ئەم کتێبە، بەڵام هەندێ لەوانەی لەبەریان گرتووەتەوە یان بڵاویان کردووەتەوە کتێبەکەیان بەپێی بابەتەکانی دابەشکردووە و، ناونیشانی ناوخۆییان بۆ دیاریکردووە، وەکو ئاسانکاری بۆ خوێنەر و فێرخواز.

پێشەکی (الجزرية) پەیوەندی بە کتێبەکانی تری (إبن الجزري) یەوە هەیە کە لەوێیش باسی بابەتەکانی زانستی تەجویدی کردووە، وەکو (التمهيد) و (النشر) و، هۆنراوەی (طيبة النشر) کە لەگەڵ پێشەکی (الجزرية) دا لە ٣٠ کۆپلەدا هاوبەشن،

---

١ بۆ ئەم نووسینەم دەربارەی ژیاننامەی (إبن الجزري) لە کتێبی (شيخ القراء الإمام ابن الجزري) سوودم بینی.

ئەوەشم بەلاوە پەسەندە[1] کە (المقدمة) زووتر نووسراوە لەپێش کتێبی (الطيبة)، هەروەها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش پەیوەندی هەیە لەگەڵ کتێبی (التمهيد)، هەربۆیە ئەو کتێبانە بەلێکدانەوە و ڕاڤەکردنێکی چاك دێتە ئەژمار بۆ ئەم هۆنراوەی کە لەبەر دەستماندایە، ڕاڤەکارانی ئەم پێشەکیەش بەم پەیوەندیەیان زانیوە و، سوودیان لەو کتێبانە زۆر وەرگرتووە.

پێشەکی (الجزرية) گرنگی زۆری پێدراوە لەلایەن پسپۆران و بایەخداران بە زانستی تەجویدەوە، لەڕووی لەبەرکردن و لەبەرگرتنەوە و، ڕاڤەکردن، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە: کورتی و پوختەیی ئەو هۆنراوەیە، هەروەها ئاسانی وشەکانی و گشتگیری بابەتەکانی بۆ هەموو باسەکانی تەجوید، لەسەرووی هەموو ئەو هۆکارانەشەوە، بەناوبانگی نووسەرەکەی لەسەردەمی خۆیدا و، سەردەمەکانی تریش، تاوەکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان، بەڵگەش لەسەر بایەخ پێدانی ئەم پێشەکی یە زۆری لێکدانەوەکانێتی لەلایەن زانایان و ڕاڤەکارانەوە، کەدەگەنە زیاتر لە پەنجا لێکدانەوەی درێژ و کورت، وەکو:

١. الحواشي المفهمة في شرح المقدمة، لأبي بكر أحمد (ت ٨٣٥ هـ).

٢. الطرازات المعلمة في شرح المقدمة الجزرية، لعبد الدائم الحديدي الأزهري، قوتابی (إبن الجزرية) چاپ کراوە.

٣. اللالئ السنية في شرح المقدمة الجزرية، لأحمد بن محمد القسطلاني (ت ٩٢٣ هـ).

٤. الدقائق المحكمة شرح المقدمة، لزكريا الأنصاري (ت ٩٢٦ هـ)

٥. المنح الفكرية في شرح المقدمة الجزرية، لملا علي القاري (ت ١٠١٤ هـ).

---

[1] خاوەن ئەم قسەیە (د.غانم قدوري الحمد)ە.

لێکدانەوەی زۆری تریشی هەیە جگە لەمانە – چاپکراون، هەندێکیش هێشتا دەستنووسن و چاپ نەکراون[١].

۞۞۞

١ بڕوانە: الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية / د.غانم قدوري ١٢ / ١٣.

## دەقی هۆنراوەکە

### پێشەکی

| | | |
|---|---|---|
| ١ | يَقُولُ رَاجِي عَفْوِ رَبٍّ سَامِعِ | (مُحَمَّدُ بْنُ الْجَزَرِيِّ الشَّافِعِي) |
| ٢ | (الْحَمْدُ لِلَّهِ) وَصَلَّى اللَّهُ | عَلَى نَبِيِّهِ وَمُصْطَفَاهُ |
| ٣ | (مُحَمَّدٍ) وَآلِهِ وَصَحْبِهِ | وَمُقْرِئِ الْقُرْآنِ مَعْ مُحِبِّهِ |
| ٤ | (وَبَعْدُ) إِنَّ هَذِهِ مُقَدِّمَهْ | فِيمَا عَلَى قَارِئِهِ أَنْ يَعْلَمَهْ |
| ٥ | إِذْ وَاجِبٌ عَلَيْهِمُ مُحَتَّمُ | قَبْلَ الشُّرُوعِ أَوَّلاً أَنْ يَعْلَمُوا |
| ٦ | مَخَارِجَ الْحُرُوفِ وَالصِّفَاتِ | لِيَلْفِظُوا بِأَفْصَحِ اللُّغَاتِ |
| ٧ | مُحَرِّرِي التَّجْوِيدِ وَالْمَوَاقِفِ | وَمَا الَّذِي رُسِّمَ فِي الْمَصَاحِفِ |
| ٨ | مِنْ كُلِّ مَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ بِهَا | وَتَاءِ أُنْثَى لَمْ تَكُنْ تُكْتَبْ بِهَا |

### بابەتی مەخرەجی پیتەکان

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | مَخَارِجُ الْحُرُوفِ سَبْعَةَ عَشَرْ | عَلَى الَّذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ |
| ١٠ | فَأَلِفُ الْجَوْفِ وَأُخْتَاهَا وَهِي | حُرُوفُ مَدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي |
| ١١ | ثُمَّ لأَقْصَى الْحَلْقِ هَمْزٌ هَاءُ | ثُمَّ لِوَسْطِهِ فَعَيْنٌ حَاءُ |
| ١٢ | أَدْنَاهُ غَيْنٌ خَاؤُهَا وَالْقَافُ | أَقْصَى اللِّسَانِ فَوْقُ ثُمَّ الْكَافُ |
| ١٣ | أَسْفَلُ وَالْوَسْطُ فَجِيمُ الشِّينُ يَا | وَالضَّادُ مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا |
| ١٤ | لاضْرَاسَ مِنْ أَيْسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا | وَاللاَّمُ أَدْنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا |
| ١٥ | وَالنُّونُ مِنْ طَرْفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا | وَالرَّا يُدَانِيهِ لِظَهْرٍ أَدْخَلُوا |
| ١٦ | وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا مِنْهُ وَمِنْ | عُلْيَا الثَّنَايَا وَالصَّفِيرُ مُسْتَكِنْ |

١٧ مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى ... وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا لِلْعُلْيَا

١٨ مِنْ طَرَفَيْهِمَا وَمِنْ بَطْنِ الشَّفَهْ ... فَالْفَا مَعَ اطْرَافِ الثَّنَايَا الْمُشْرِفَهْ

١٩ لِلشَّفَتَيْنِ الْوَاوُ بَاءٌ مِيمُ ... وَغُنَّةٌ مَخْرَجُهَا الْخَيْشُومُ

## بابەتی سیفەتەکان

٢٠ صِفَاتُهَا جَهْرٌ وَرِخْوٌ مُسْتَفِلْ ... مُنْفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ وَالضِّدَّ قُلْ

٢١ مَهْمُوسُهَا (فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ) ... شَدِيدُهَا لَفْظُ (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ)

٢٢ وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ (لِنْ عُمَرْ) ... وَسَبْعُ عُلْوٍ (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) حَصَرْ

٢٣ وَصَادُ ضَادٌ طَاءُ ظَاءٌ مُطْبَقَهْ ... وَ(فِرَّ مِنْ لُبِّ) الْحُرُوفُ الْمُذْلَقَهْ

٢٤ صَفِيرُهَا صَادٌ وَزَايٌ سِينُ ... قَلْقَلَةٌ (قُطْبُ جَدٍ) وَاللِّينُ

٢٥ وَاوٌ وَيَاءٌ سَكَنَا وَانْفَتَحَا ... قَبْلَهُمَا وَالانْحِرَافُ صُحِّحَا

٢٦ فِي اللاَّمِ وَالرَّا وَبِتَكْرِيرٍ جُعِلْ ... وَلِلتَّفَشِّي الشِّينُ ضَادًا اسْتَطِلْ

## بابەتی تەجوید

٢٧ وَالأَخْذُ بِالتَّجْوِيدِ حَتْمٌ لازِمُ ... مَنْ لَمْ يُجَوِّدِ الْقُرَآنَ آثِمُ

٢٨ لأَنَّهُ بِهِ الإِلَهُ أَنْزَلا ... وَهَكَذَا مِنْهُ إِلَيْنَا وَصَلا

٢٩ وَهُوَ أَيْضًا حِلْيَةُ التِّلاوَةِ ... وَزِينَةُ الأَدَاءِ وَالْقِرَاءَةِ

٣٠ وَهُوَ إِعْطَاءُ الْحُرُوفِ حَقَّهَا ... مِنْ صِفَةٍ لَهَا وَمُسْتَحَقَّهَا

٣١ وَرَدُّ كُلِّ وَاحِدٍ لأَصْلِهِ ... وَاللَّفْظُ فِي نَظِيرِهِ كَمِثْلِهِ

٣٢ مُكَمَّلا مِنْ غَيْرِ مَا تَكَلُّفِ ... بِاللُّطْفِ فِي النُّطْقِ بِلا تَعَسُّفِ

٣٣ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ تَرْكِهِ ... إِلاَّ رِيَاضَةُ امْرِئٍ بِفَكِّهِ

## بابەتی گەورەکردن و بچووک کردنەوە

٣٤ فَرَقِّقَنْ مُسْتَفِلاً مِنْ أَحْرُفِ ... وَحَاذِرَنْ تَفْخِيمَ لَفْظِ الأَلِفِ

٣٥ كَهَمْزِ الْحَمْدُ أَعُوذُ إِهْدِنَا ... اللَّهُ ثُمَّ لاَمِ لِلَّهِ لَنَا

٣٦ وَلْيَتَلَطَّفْ وَعَلَى اللَّهِ وَلاَ الضْ ... وَالْمِيمِ مِنْ مَخْمَصَةٍ وَمِنْ مَرَضْ

٣٧ وَبَاءِ بَرْقٍ بَاطِلٍ بِهِمْ بِذِي ... وَاحْرِصْ عَلَى الشِّدَّةِ وَالْجَهْرِ الَّذِي

٣٨ فِيهَا وَفِي الْجِيمِ كَحُبِّ الصَّبْرِ ... وَرَبْوَةٍ اجْتُثَّتْ وَحَجِّ الْفَجْرِ

٣٩ وَبَيِّنَنْ مُقَلْقَلاً إِنْ سَكَنَا ... وَإِنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ كَانَ أَبْيَنَا

٤٠ وَحَاءَ حَصْحَصَ أَحَطتُّ الْحَقُّ ... وَسِينَ مُسْتَقِيمِ يَسْطُو يَسْقُو

## بابەتی ڕائەکان

٤١ وَرَقِّقِ الرَّاءَ إِذَا مَا كُسِرَتْ ... كَذَاكَ بَعْدَ الْكَسْرِ حَيْثُ سَكَنَتْ

٤٢ إِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلِ حَرْفِ اسْتِعْلاَ ... أَوْ كَانَتِ الْكَسْرَةُ لَيْسَتْ أَصْلاَ

٤٣ وَالْخُلْفُ فِي فِرْقٍ لِكَسْرٍ يُوجَدُ ... وَأَخْفِ تَكْرِيرًا إِذَا تُشَدَّدُ

## بابەتی لامەکان

٤٤ وَفَخِّمِ اللاَّمَ مِنِ اسْمِ اللَّهِ ... عَنْ فَتْحٍ أَوْ ضَمٍّ كَعَبْدُ اللَّهِ

٤٥ وَحَرْفَ الاسْتِعْلاَءِ فَخِّمْ وَاخْصُصَا ... لاطْبَاقَ أَقْوَى نَحْوُ قَالَ وَالْعَصَا

٤٦ وَبَيِّنِ الإِطْبَاقَ مِنْ أَحَطتُّ مَعْ ... بَسَطتَّ وَالْخُلْفُ بِنَخْلُقكُّمْ وَقَعْ

٤٧ وَاحْرِصْ عَلَى السُّكُونِ فِي جَعَلْنَا ... أَنْعَمْتَ وَالْمَغْضُوبِ مَعْ ضَلَلْنَا

٤٨ وَخَلِّصِ انْفِتَاحَ مَحْذُورًا عَسَى ... خَوْفَ اشْتِبَاهِهِ بِمَحْظُورًا عَصَى

٤٩ وَرَاعِ شِدَّةً بِكَافٍ وَبِتَا ... كَشِرْكِكُمْ وَتَتَوَفَّى فِتْنَتَا

| ژ | | |
|---|---|---|
| ٥٠ | وَأَوَّلَى مِثْلٍ وَجِنْسٍ إِنْ سَكَنْ | أَدْغِمْ كَقُلْ رَبِّ وَبَلْ لَا وَأَبِنْ |
| ٥١ | فِي يَوْمِ مَعْ قَالُوا وَهُمْ وَقُلْ نَعَمْ | سَبِّحْهُ لَا تُزِغْ قُلُوبَ فَالْتَقَمْ |

**بابەتی (ض) و (ظ)**

| ژ | | |
|---|---|---|
| ٥٢ | وَالضَّادَ بِاسْتِطَالَةٍ وَمَخْرَجِ | مَيِّزْ مِنَ الظَّاءِ وَكُلُّهَا تَجِي |
| ٥٣ | فِي الظَّعْنِ ظِلِّ الظُّهْرِ عُظْمِ الْحِفْظِ | أَيْقِظْ وَأَنْظِرْ عَظْمِ ظَهْرِ اللَّفْظِ |
| ٥٤ | ظَاهِرْ لَظَى شُوَاظُ كَظْمٍ ظَلَمَا | اغْلُظْ ظَلَامَ ظُفُرٍ انْتَظِرْ ظَمَا |
| ٥٥ | أَظْفَرَ ظَنًّا كَيْفَ جَا وَعَظْ سِوَى | عِضِينَ ظَلَّ النَّحْلُ زُخْرُفٍ سَوَى |
| ٥٦ | وَظَلْتَ ظَلْتُمْ وَبِرُومٍ ظَلُّوا | كَالْحِجْرِ ظَلَّتْ شُعَرَا نَظَلُّ |
| ٥٧ | يَظْلَلْنَ مَحْظُورًا مَعَ الْمُحْتَظِرِ | وَكُنْتَ فَظًّا وَجَمِيعِ النَّظَرِ |
| ٥٨ | إِلَّا بِوَيْلٌ هَلْ وَأُولَى نَاضِرَهْ | وَالْغَيْظِ لَا الرَّعْدِ وَهُودٍ قَاصِرَهْ |
| ٥٩ | وَالْحَظُّ لَا الْحَضُّ عَلَى الطَّعَامِ | وَفِي ضَنِينٍ الْخِلَافُ سَامِي |

**بابەتی وریاكردنەوە**

| ژ | | |
|---|---|---|
| ٦٠ | وَإِنْ تَلَاقَيَا الْبَيَانُ لَازِمُ | أَنْقَضَ ظَهْرَكَ يَعَضُّ الظَّالِمُ |
| ٦١ | وَاضْطُرَّ مَعْ وَعَظْتَ مَعْ أَفَضْتُمُ | وَصَفِّ هَا جِبَاهُهُمْ عَلَيْهِمُ |

**بابەتی (م) و (ن)ی شەددەدار و زەننەدار**

| ژ | | |
|---|---|---|
| ٦٢ | وَأَظْهِرِ الْغُنَّةَ مِنْ نُونٍ وَمِنْ | مِيمٍ إِذَا مَا شُدِّدَا وَأَخْفِيَنْ |
| ٦٣ | الْمِيمَ إِنْ تَسْكُنْ بِغُنَّةٍ لَدَى | بَاءٍ عَلَى الْمُخْتَارِ مِنْ أَهْلِ الْأَدَا |
| ٦٤ | وَأَظْهِرَنْهَا عِنْدَ بَاقِي الْأَحْرُفِ | وَاحْذَرْ لَدَى وَاوٍ وَفَا أَنْ تَخْتَفِي |

**بابەتی بنەماكانی تەنوین و نونی زەننەدار**

| ژ | | |
|---|---|---|
| ٦٥ | وَحُكْمُ تَنْوِينٍ وَنُونٍ يُلْفَى | إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ اخْفَا |

| | | |
|---|---|---|
| ٦٦ | فَعِنْدَ حَرْفِ الحَلْقِ أَظْهِرْ وَادَّغِمْ | فِي اللاَّمِ وَالرَّا لاَ بِغُنَّةٍ لَزِمْ |
| ٦٧ | وَأَدْغِمَنْ بِغُنَّةٍ فِي يُومِنُ | إِلاَّ بِكِلْمَةٍ كَدُنْيَا عَنْوَنُوا |
| ٦٨ | وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا | لاخْفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِذَا |

## بابەتی (مد) و (قصر)

| | | |
|---|---|---|
| ٦٩ | وَالمَدُّ لاَزِمٌ وَوَاجِبٌ أَتَى | وَجَائِزٌ وَهْوَ وَقَصْرٌ ثَبَتَا |
| ٧٠ | فَلاَزِمٌ إِنْ جَاءَ بَعْدَ حَرْفِ مَدّْ | سَاكِنُ حَالَيْنِ وَبِالطُّولِ يُمَدّْ |
| ٧١ | وَوَاجِبٌ إِنْ جَاءَ قَبْلَ هَمْزَةِ | مُتَّصِلاً إِنْ جُمِعَا بِكِلْمَةِ |
| ٧٢ | وَجَائِزٌ إِذَا أَتَى مُنْفَصِلاَ | أَوْ عَرَضَ السُّكُونُ وَقْفًا مُسْجَلاَ |

## بابەتی زانینی ڕاوەستان

| | | |
|---|---|---|
| ٧٣ | وَبَعْدَ تَجْوِيدِكَ لِلْحُرُوفِ | لاَبُدَّ مِنْ مَعْرِفَةِ الوُقُوفِ |
| ٧٤ | وَالابْتِدَاءِ وَهْيَ تُقْسَمُ إِذَنْ | ثَلاَثَةٌ تَامٌّ وَكَافٍ وَحَسَنْ |
| ٧٥ | وَهْيَ لِمَا تَمَّ فَإِنْ لَمْ يُوجَدِ | تَعَلُّقٌ أَوْ كَانَ مَعْنًى فَابْتَدِي |
| ٧٦ | فَالتَّامُ فَالْكَافِي وَلَفْظًا فَامْنَعَنْ | إِلاَّ رُؤُوسَ الآيِ جَوِّزْ فَالْحَسَنْ |
| ٧٧ | وَغَيْرُ مَا تَمَّ قَبِيحٌ وَلَهُ | الوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيُبْدَا قَبْلَهُ |
| ٧٨ | وَلَيْسَ فِي القُرْآنِ مِنْ وَقْفٍ وَجَبْ | وَلاَ حَرَامٌ غَيْرَ مَا لَهُ سَبَبْ |

## بابەتی پچڕاو و پێکگەیەنرا و (ت)

| | | |
|---|---|---|
| ٧٩ | وَاعْرِفْ لِمَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ وَتَا | فِي مُصْحَفِ الإِمَامِ فِيمَا قَدْ أَتَى |
| ٨٠ | فَاقْطَعْ بِعَشْرِ كَلِمَاتٍ أَنْ لاَ | مَعْ مَلْجَإٍ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ |
| ٨١ | وَتَعْبُدُوا يَاسِينَ ثَانِي هُودَ لاَ | يُشْرِكْنَ تُشْرِكْ يَدْخُلَنْ تَعْلُوا عَلَى |

٨٢ أَنْ لاَ يَقُولُوا لاَ أَقُولَ إِنْ مَا — بِالرَّعْدِ وَالْمَفْتُوحَ صِلْ وَعَنْ مَا

٨٣ نُهُوا اقْطَعُوا مِنْ مَا بِرُومٍ وَالنِّسَا — خُلْفُ الْمُنَافِقِينَ أَمْ مَنْ أَسَّسَا

٨٤ فُصِّلَتْ النِّسَا وَذِبْحِ حَيْثُ مَا — وَأَنْ لَمِ الْمَفْتُوحَ كَسْرُ إِنَّ مَا

٨٥ لاَنْعَامِ وَالْمَفْتُوحَ يَدْعُونَ مَعًا — وَخُلْفُ الاَنْفَالِ وَنَحْلٍ وَقَعَا

٨٦ وَكُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَاخْتُلِفْ — رُدُّوا كَذَا قُلْ بِئْسَمَا وَالْوَصْلُ صِفْ

٨٧ خَلَفْتُمُونِي وَاشْتَرَوْا فِي مَا اقْطَعَا — أُوحِيْ أَفَضْتُمُ اشْتَهَتْ يَبْلُوا مَعًا

٨٨ ثَانِي فَعَلْنَ وَقَعَتْ رُومُ كِلاَ — تَنْزِيلُ شُعَرَاءٍ وَغَيْرَ ذِي صِلاَ

٨٩ فَأَيْنَمَا كَالنَّحْلِ صِلْ وَ مُخْتَلِفْ — فِي الشُّعَرَا الأَحْزَابِ وَالنِّسَا وُصِفْ

٩٠ وَصِلْ فَإِلَّمْ هُودَ أَلَّنْ نَجْعَلاَ — نَجْمَعَ كَيْلاَ تَحْزَنُوا تَأْسَوْا عَلَى

٩١ حَجٌّ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَقَطْعُهُمْ — عَنْ مَنْ يَشَاءُ مَنْ تَوَلَّى يَوْمَ هُمْ

٩٢ وَمَالِ هَذَا وَالَّذِينَ هَؤُلاَ — تَ حِينَ فِي الإِمَامِ صِلْ وَوُهِّلاَ

٩٣ وَوَزَنُوهُمْ وَكَالُوهُمْ صِلِ — كَذَا مِنَ الْ وَهَا وَيَا لاَ تَفْصِلِ

## بابەتی تائەکان

٩٤ وَرَحْمَتُ الزُّخْرُفِ بِالتَّا زَبَرَهْ — لاَعْرَافِ رُومٍ هُودٍ كَافِ الْبَقَرَهْ

٩٥ نِعْمَتُهَا ثَلاَثُ نَحْلٍ إِبْرَهَمْ — مَعًا أَخِيرَاتٌ عُقُودُ الثَّانِ هَمْ

٩٦ لُقْمَانُ ثُمَّ فَاطِرٌ كَالطُّورِ — عِمْرَانَ لَعْنَتَ بِهَا وَالنُّورِ

٩٧ وَامْرَأَتٌ يُوسُفَ عِمْرَانَ الْقَصَصْ — تَحْرِيمَ مَعْصِيَتْ بِقَدْ سَمِعْ يُخَصّْ

٩٨ شَجَرَتَ الدُّخَانِ سُنَّتْ فَاطِرِ — كُلاًّ وَالاَنْفَالَ وَحَرْفَ غَافِرِ

٩٩ قُرَّتُ عَيْنٍ جَنَّتٌ فِي وَقَعَتْ — فِطْرَتْ بَقِيَّتْ وَابْنَتْ وَكَلِمَتْ

| | | |
|---|---|---|
| ١٠٠ | أَوْسَطَ الأَعْرَافِ وَكُلُّ مَا اخْتُلِفْ | جَمْعًا وَفَرْدًا فِيهِ بِالتَّاءِ عُرِفْ |

## بابەتی هەمزەی پێکگەیاندن

| | | |
|---|---|---|
| ١٠١ | وَابْدَأْ بِهَمْزِ الْوَصْلِ مِنْ فِعْلٍ بِضَمْ | إِنْ كَانَ ثَالِثٌ مِنَ الْفِعْلِ يُضَمْ |
| ١٠٢ | وَاكْسِرْهُ حَالَ الْكَسْرِ وَالْفَتْحِ وَفِي | لاسْمَاءِ غَيْرَ اللامِ كَسْرُهَا وَفِي |
| ١٠٣ | ابْنٍ مَعَ ابْنَةِ امْرِئٍ وَاثْنَيْنِ | وَامْرَأَةٍ وَاسْمٍ مَعَ اثْنَتَيْنِ |
| ١٠٤ | وَحَاذِرِ الْوَقْفَ بِكُلِّ الحَرَكَهْ | إِلاَّ إِذَا رُمْتَ فَبَعْضُ حَرَكَهْ |
| ١٠٥ | إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ وَأَشِمْ | إِشَارَةً بِالضَّمِّ فِي رَفْعٍ وَضَمْ |

## کۆتایی

| | | |
|---|---|---|
| ١٠٦ | وَقَدْ تَقَضَّى نَظْمِيَ الْمُقَدِّمَهْ | مِنِّي لِقَارِئِ الْقُرْآنِ تَقْدِمَهْ |
| ١٠٧ | أَبْيَاتُهَا قَافٌ وَزَايٌ فِي الْعَدَدْ | مَنْ يُحْسِنِ التَّجْوِيدَ يَظْفَرْ بِالرَّشَدْ |
| ١٠٨ | (وَالحَمْدُ للهِ) لَهَا خِتَامُ | ثُمَّ الصَّلاةُ بَعْدُ وَالسَّلامُ |
| ١٠٩ | عَلَى النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى وَآلِهِ | وَصَحْبِهِ وَتَابِعِي مِنْوَالِهِ |

✿✿✿

یەکێك لەو شتانەی دانەرانی کتێب لە زانستە ئیسلامیەکاندا پێوەی هۆگر بوون، دەستپێکردنی کتێبەکانیان بوو بە هێنانی ناوی خوای گەورە و، سوپاس کردنی و سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).

(الخطیب البغدادي) کە لەساڵی ٤٦٣ ك لە دونیا دەرچووە، دەفەرموێت:
(پێویستە دەست پێکردن لە هەموو کتێبێکی زانستدا بە "بسم الله الرحمن الرحیم" بێت)[١].

لە ڕاستیشدا شێوازێکی نەگۆڕ نیە بۆ وتاری دەستپێکردنی دانانی کتێب.
پێشەوا (النووي) کە لەساڵی ٦٧٦ ك لە دونیا دەرچووە دەفەرموێت: سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش وتنی (الحمد لله) ئەوە پیشەی زانایانە ڕەحمەتی خوایان لێبێت... زانایانیش بە (مکروه) یان زانیوە کەسێك تەنها وشەی (الصلاة) بەبێ (السلام) بەکار بهێنێ لە سەلاواتدا.[٢]

(إبن حجر العسقلاني) کە لە ساڵی ٨٥٢ ك لە دونیا دەرچووە، دەفەرموێت: (وتاری دەستپێکردنی نووسینی کتێب کورت هەڵنەهاتووە لەسەر شێوازێك نەتوانرێت لێی لابدرێت، بەڵکو تەنها مەبەست لەوەیە شێوازی دەستپێکردنەکە ئامانج بپێکێت)[٣].

وتەی دانەریش لەسەرەتای ئەم هۆنراوەیەوە: (بسم الله الرحمن الرحیم) واتە: دەست پێدەکەم و، هۆنراوەکەم ڕێك دەخەم و، کتێب دادەنێم بە پەنابردن بەناوی خوای گەورە[٤].

---

[١] بڕوانە: الجامع لأخلاق الراوي ١/١٩٣، بەوەرگرتن لە الشرح الوجیز علی المقدمة الجزریة/ د.غانم قدوري الحمد / ٢٥.

[٢] بڕوانە: صحیح مسلم بشرح النووي ١/٤٣-٤٤، بەوەرگرتن لە الشرح الوجیز /٢٥.

[٣] بڕوانە: فتح الباري ١/٨، بەوەرگرتن لە الشرح الوجیز /٢٥.

[٤] بڕوانە: القسطلاني: اللالئ السنیة / ١٤، بەوەرگرتن لە الشرح الوجیز /٢٥.

١. يَقُولُ رَاجِـي عَفْـو رَبّ سَـامِعِ (مُحَـمَّـدُ بْنُ الْجَـزَرِيّ الشَّافِعِي)

**لێكدانەوەی وشەكان:**

(يَقُولُ) **واتە:** دەڵێت، دانەر وشەی (يَقُولُ)ی بەشێوازی ڕانەبردوو (مضارع) بەكارهێناوە، ڕابردوو و ڕانەبردووش وەكو یەكن لێرەدا بێجیاوازی.

(رَاجِـي) **واتە:** تكاكار، تكاكردن بۆ شتێك كە شیاوی جیبەجێكردن بێت.

(عَفْو) **واتە:** لێبوردن و لێنەگرتن.

(رَبٍّ) وشەیەكی هاوبەشە—وەكو خالد الأزهري دەڵێت:—بە سەرگەورە و خاوەن و چاكساز و پەروەرشیار دەوترێت، بەڵام ئەگەر ئەم وشەیە بە ڕەهایی بێت ئەوا خوای گەورە دەگرێتەوە و بە كەسی تر ناوترێت (رَبٍّ)، مەگەر بەتایبەت كردن وەكو: (رب الدار) **واتە:** خاوەن ماڵ و وشەی لەو شێوە.

(سَامِعِ)[1] **واتە:** بیسەر، بەڵام (سمیع) گونجاوتر بوو، چونكە زیاتر بەكارهاتووە لە دەقە شەرعیەكاندا[2].

(مُحَـمَّـدُ) ناوی دانەری پێشەكیەكەیە ڕەحمەتی خوای لێبێت.

(الْجَـزَرِيّ) مەبەست لە دورگەی ئیبنو عومەرە لە وڵاتی ڕۆژهەڵات.

---

[1] ناو و سیفەتەكانی خوای گەورە تەوقیفیە و هەموو ناوەكانی بە صیغەی موبالەغە هاتووە، جا سەمیع لەسەر وەزنی (فعیل)ە و موبالەغەیە، بەڵام سامیع تەنها (إسم فاعل)ە و هیچ موبالەغەیەكی تێدا نیە بەڵام بۆ پاراستنی وەزنی هۆنراوەكە بەكاری هێناوە ((م.دلێر گەرمیانی))

[2] بڕوانە: المنح الفكرية شرح المقدمة الجزرية / ملا علي القاري / ص ٢٠.

**واتای گشتی:**

**موحەممەدی کوڕی جەزەری شافیعی، کە تکاکارە بەر لێبوردنی پەروەردگاری بیسەری بکەوێت دەڵێت:**

٢. (الْحَمْدُ للّهِ) وَصَلَّى اللّهُ عَلَى نَبِيِّهِ وَمُصْطَفَاهُ

**(الْحَمْدُ) واته: ستایش کردن بە زمان بەمەبەستی مەزن ڕاگرتن، ئیتر ئایا لە بەرانبەر نیعمەتێك بێت یان نا، بەلأم وشەی (الشکر) سوپاس و مەزن ڕاگرتنە بۆ پەروەردگار بەرانبەر بە نیعمەتێك کە بەخشیویەتی، دەسپێکردنی دانەریش بەم وشەیە مانای شوێن کەوتنێتی بۆ قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ).**

**(وَصَلَّى اللّهُ) وشەی (الصلاة) لەلایەن خوای گەورەوە بەزەییە و[1]، لەلایەن فریشتەکانەوە داوای لێخۆشبوونە و، لەلایەن ئادەمیزادەوە نزاو پاڕانەوەیە[2].**

**(عَلَى نَبِيِّهِ) وشەی (النبي) ئەگەر بە هەمزەوە بێت لە (النبأ)ەوە هاتووە واته: هەواڵ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەلای پەروەردگاری هەواڵ دەهێنێت، ئەگەر بەبێ "هەمزەش" بێت لە (النبوة)وە هاتووە، واته: بەرزایی، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) خاوەنی پلەوپایەی بەرزە لەلای پەروەردگاری.**

**(مُصْطَفَاه) واته: هەڵبژێردراوی خوای گەورە، وەکو لە صەحیحی پێشەوا موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی " إن الله اصطفى كنانة من ولد**

---

**[1] قال البخاري: قال أبو العالية: صلاة الله: ثنائه عليه عند الملائكة. مەبەست لەم صەلاواتە ئەوەیە خوای گەورە بەندەکانی ئاگەدار دەکاتەوە سەبارەت بە پلەوپایەی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی ستایشی دەکات و لەلای مەلائیکە نزیکەکانی باسی دەکات. ((م.دلێر گەرمیانی))**

**[2] بڕوانە: جامع شروح مقدمة الجزرية / ٢٠.**

إسماعيل، واصطفى قريشاً من كنانة، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم، فأنا خيار من خيار من خيار.[١] "

واتە: "خوای گەورە هۆزی کینانەی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژاردووە و، هۆزی قورەیشی لە کینانە هەڵبژاردووە و، نەوەی هاشیمی لە قورەیش هەڵبژاردووە و، منیشی لە نەوەی هاشیم هەڵبژاردووە، بۆیە من چاکی نێو چاکانی نێو چاکانم"

واتای گشتی:

سوپاس بۆ خوا و سۆز و، بەزەیشی لەسەر پێغەمبەر و هەڵبژاردەکەی بێت (ﷺ).

٣. (مُحَمَّدٍ) وَآلِـهِ وَصَحْبِـهِ وَمُقْرِئِ الْقُرْآنِ مَعْ مُحِبِّهِ

(مُحَمَّدٍ) (ﷺ)، ناوی پێغەمبەرە (ﷺ)، لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە کە بە، عەبدولموتتەلیبی باپیری پێغەمبەر (ﷺ) وترا کاتێك لە ڕۆژی حەوتەمدا ناوی کوڕەزاکەی نا موحەممەد، وتیان بۆچی ناوت ناوە موحەممەد ؟ لەکاتێکدا لە باوباپیران و خزمەکانتدا ئەو ناوە نەنراوە !، وتی ئومێد دەکەم لە ئاسمان و زەمیندا ستایش بکرێت، خوای گەورەش ئومێدەکەی بەدی هێنا.

(وَآلِـهِ)[٢] ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: خزمە ئیماندارەکانی دەگرێتەوە لە بەنی هاشم و بەنی عەبدولموتتەلیب.

---

١ اخرجه مسلم، كتاب الفضائل، باب فضل نسب النبي (ﷺ)، برقم ( ٢٢٧٦) و الترمذي و غيره من حديث واثلة بن الاسقع (ﷺ).

٢ آل: ئەگەر کۆ بکرێتەوە لەگەل (أتباع) واتە: (آله و أتباعه) ئەوا (آل) واتە: خزمە ئیماندارەکانی، ئەگەریش بەتەنها بێت واتە شوێن کەوتوانی لەپێش هەموانیشەوە خزمە ئیماندارەکانی دەگرێتەوە. ((م.دلێر گەرمیانی)).

(وَصَحْبِهِ) كۆیە بۆ وشەی (صحابي) واتە: هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ)، وشەی (صحابي) هەموو كەسێك دەگرێتەوە كە بە موسوڵمانی كۆبوبێتەوە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەر بۆ ساتێكی كەمیش بووبێت و مردبێتیش لەسەر ئیمان.

(وَمُقْرِئ الْقُرْآنِ) ئەو كەسەیە كە كردەوەی پێدەكات، یان مامۆستایە.

(مَعْ مُحِبِّهِ) ئەو كەسەی كە قورئانی خۆش دەوێت، قوتابیش دەگرێتەوە.

**واتای گشتی:**

درودو سڵاوی خوای گەورە بڕژێتە سەر خاوخێزان و خزمان و یارو یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها لەسەر ئەو كەسەش كە كردەوە بە قورئان دەكات، ئەو كەسەش كە قورئانی خۆش دەوێت.

٤. (وَبَعْدُ) إِنَّ هَذِهِ مُقَدِّمَهْ فِيمَا عَلَى قَارِئِهِ أَنْ يَعْلَمَهْ

(وَبَعْدُ) واتە: لەپاش باسكردنی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو سەلاوات ناردن بۆ پێغەمبەری نازدار (ﷺ)، ئەم وشەیە عەرەب بەكاریان هێناوە، كاتێك ویستوویانە لە باسێكەوە بچن بۆ باسێكی تر.

(إِنَّ هَذِهِ) ئاماژەیە بۆ شتێكی هەست پێكراو كە ئەم هۆنراوەیە، كە ئێمە لێرەدا خەریكی لێكدانەوەیین.

(مُقَدِّمَهْ) واتە: پێشەكی، وەكو ئەو دەستەی پێشی سوپا ڕێ دەكەن پێیان دەوترێت(مقدمة الجیش)، هەر لەم واتایەشەوە خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ} الحجرات١.

(فِيمَا عَلَى قَارِئِهِ أَنْ يَعْلَمَهْ) **واتە: ڕوون كردنەوەی ئەو شتانەیە كە پێویستن لەسەر خوێنەری قورئان بیانزانێت.**

**واتای گشتی:**

**لەپاش سوپاس و ستایشی خوای دلۆڤان و، صەلاَوات ناردن بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، ئەم هۆنراوەیەم پێشەكیەكە سەبارەت بەو مەسەلانەی كە پێویستە خوێنەری قورئان بیانزانێت.**

٭٭٭

## بەشەکانی زانستی تەجوید

٥. إِذْ وَاجِـبٌ عَلَيْهِمُ مُحَتَّمُ قَبْلَ الشُّرُوعِ أَوَّلاً أَنْ يَعْلَمُوا

(إِذْ وَاجِـبٌ) ئەو شتانەی بە ڕەهایی پێویستن و، وازلێهێنانیان گوناهە.

(عَلَيْهِمُ) **واتە:** لەسەر قورئان خوێنەران.

(مُحَتَّـم) وشەیەکە بۆ جەخت لەسەر کردن هاتووە.

(قَبْلَ الشُّرُوعِ) **واتە:** پێش دەستپێکردنی قورئان خویندن.

(أَوَّلاً) **واتە:** جەخت کردنەوەیە لەسەر وشەی پێش خۆی.

(يَعْلَمُوا) **واتە:** بیزانن.

**واتای گشتی:**

پێویستە لەسەر ئەوانەی کە قورئان دەخوێنن پێش دەستپێکردنیان ئەم مەسەلانە بزانن.

٦. مَخَارِجَ الحُرُوفِ وَالصِّفَاتِ لِيَلْفِظُوا بِأَفْصَحِ اللُّغَاتِ

(مَخَارِجَ الحُرُوفِ) **واتە:** جێگای دەرچوونی پیتەکانی زمانی عەرەبی، کە بریتین لە (٢٩) پیت، بەڵام بەگشتی زانایان سێ ڕێڕەویان هەیە، سەبارەت بە ژمارەی مەخرەجەکان:

**ڕێڕەوی یەکەم:** ژمارەیان (١٤) مەخرەجە، ئەمانەش بە بۆچوونی (الفراء) و (قطرب) و ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئەوانن، مەخرەجی (الجوف) **واتە:** بۆشایی نێوان گەروو و دەم یان لابردووە، هەروەها جێگەی پیتەکانی (ل، ر، ن) بەیەك مەخرەج دادەنرێن لەجیاتی (٣) مەخرەج.

**ڕێڕەوی دووەم:** ژمارەی مەخرەجەکان (١٦)ەیە، ئەمەش ڕێڕەوی (سیبویە) و (الشاطبي) و (إبن البري) و هاوبۆچوونەکانیانە، ئەمانیش مەخرەجی جەوفیان لابردووە، وایان داناوە کە ئەو پیتانە لە شوێنە هاوشێوەکانیانەوە دەردەچن واتە لەمەخرەجەکانی ترەوە.

**ڕێڕەوی سێیەم:** ژمارەی مەخرەجەکان (١٧) مەخرەجن، ئەمەش ڕێڕەوی (الخليل بن أحمد الفراهيدي) و ئەوانەیە کە لەسەر بۆچوونی ئەون، وەکو: (إبن الجزري) و جومهوری زانایانی پسپۆر لەم بوارەدا ئەم ڕێڕەوەیان پەسەند کردووە[١].

(وَالصِّفَاتِ) **واتە:** هەروەها سیفەتی پیتەکانیش بناسن.

(لِيَلْفِظُوا) لە نوسخەیەکدا هاتووە (لينطقوا) **واتە:** قسەبکەن و بیخوێننەوە.

(بِأَفْصَحِ اللُّغَاتِ) **واتە:** بە پاراوترین زمان لەنێو زمانەکاندا زمانی عەرەبیە، کە زمانی پێغەمبەرە (ﷺ) و، قورئانی پێدابەزیوە.

ڕێکەوتیش نیە کە خوای گەورە لە نێوان هەموو زمانەکانی مرۆڤایەتیدا زمانی عەرەبی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی پەیامی کۆتایی بۆ خەڵکی سەرزەوی بنێرێت، لەڕاستیدا ئەم زمانە تایبەتمەندی زۆری هەیە، هەرچۆنێکیش بێت زمانێکی ئایینیە بۆمان و ئەرکی سەرشانیشمانە بەرگری لێبکەین، ئاشکرایشە کە چۆن هەوڵەکان چڕ

---

١ بڕوانە: الواضح في أحكام التجويد / د.محمد عصام القضاة / ٣٠.

كراونەتەوە بۆ دژایەتیكردنی ئەم زمانە بەپێی ئامانجگەلێكی دوور كە ئەوانەی بە پلانەكە هەڵدەستن ڕەچاویان كردووە، لەوەش دڵنیان كەدروست بوونی نەوەیەكی لاواز لە زمانی عەرەبیدا واتە نەوەیەكی تێنەگەیشتوو لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمەش ئامانجە ڕاستەقینەكەیە.

لەسەرەتاكانی سەدەی بیستەم و تاكو ناوەڕاستی ئەو سەدەیە، هەوڵێكی چڕ و بێووچان بەخەرج درا لەپێناوی لابردنی زمانی عەرەبی لە ولاتی میسر، لەڕێگەی بەكارهێنانی پیتی لاتینی لەجیاتی پیتی عەرەبی، بەلام سەرانی موسوڵمانان لەو ولاتە دەركیان كردبە گلاوی ئەو پیلانە و، ڕووبەڕووی بوونەوەو هەر بە ساوایی و لە بێشكەدا ئەو بیرۆكەیان لەنێو برد، بەلام مەخابن وا ئەو بیرۆكەیە جارێكی ترو پاش زیاتر لە نیو سەدە سەری هەڵداوەتەوە و، پێویستە لەسەر موسوڵمانان بەرگری لە زمانی عەرەبی بكەن چونكە زمانی قورئان و سوننەتە، مامۆستا (أنور الجندي) ڕەحمەتی خوای لێبێت، دەڵێت: ئەمڕۆ زمانی عەرەبی زمانی گفتوگۆ كردنە بۆ سەدملیۆن عەرەب و، زمانی هزرە بۆ هەزار ملیۆن موسوڵمان[١]، زمانێكی دێرینیشە كە پێش هاتنی ئیسلام بە هەزار ساڵ قسەی پێكراوە.

(الخليل بن أحمد الفراهيدي) لە كتێبی (العين)دا دەڵێت: تێكڕای وشەكانی زمانی عەرەبی كە گفتوگۆیان پێدەكرێت بەوانەشەوە كە فەرامۆش كراون دەگاتە (١٢،٣٠٥،٤١٢) وشە.

---

[١] ئەوە سەرژمێری هەشتاكانە ، چونكە ژمارەی موسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا دەگاتە یەك ملیار و سێ سەد ملیۆن كەس لە جیهاندا.

هەروەها (الحسين الزبيرى) دەڵێت: وشەکانی زمانی عەرەبی ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە شەش ملیۆن و پێنج سەد هەزار وشە، کار بە (٥٤٢٠) وشەی دەکرێت، ئەوەکانی تر هەمووی پەراوێز خراون [١].

واتای گشتی:

پێویستە لەسەر خوێنەرانی قورئان شوێنی دەرچوونی پیتەکان و سیفەتەکانیان بزانن، بۆئەوەی شارەزایی پەیدا بکەن دەربارەی چاکترین و پاراوترین زمان کە زمانی عەرەبییە.

٧. مُحَرِّرِي التَّجْوِيدِ وَالمَوَاقِفِ ‌ ‌ ‌ وَمَا الَّذِي رُسِّمَ فِي المَصَاحِفِ

(مُحَرِّرِي) واتە: پێویستە لەسەریان ئەوانەی کە باسکراون بیزانن مادام کۆشش دەکەن بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان.

(وَالمَوَاقِفِ) واتە: شوێنەکانی ڕاوەستان و دەستپێکردن لە قورئاندا.

(وَمَا الَّذِي رُسِّمَ فِي المَصَاحِفِ) واتە: ئەو شێوازانەی کە قورئانی پێنووسراوەتەوە لە موسحەفەکانی پێشەوا عوسمان (رضي الله عنه)، چونکە ڕوکنێکی قورئانە، دوو ڕوکنەکەی تریش بریتین لە (تواتر) و گونجان لەگەڵ شێوەیەك لە شێوەکانی زمانی عەرەبی [٢].

واتای گشتی:

ئەوانەی کە ورد دەبنەوە لە جوان خوێندنەوەی قورئان و، ڕاوەستان و دەست پێکردنی ڕێکوپێك و، ڕەچاوکردنی خوێندنەوە بەپێی ئەو ڕێنووسەی کەلە موسحەفەکانی عوسماندا (رضي الله عنه) هاتووە.

---

١ بڕوانە: دراسات إسلامية معاصرة / ٣٣.

٢ بڕوانە: الدرر البهية شرح المقدمة الجزرية / ١١.

٨. مِنْ كُلِّ مَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ بِهَا وَتَاءِ أُنْثَى لَمْ تَكُنْ تُكْتَبْ بِهَا

(مِنْ كُلِّ مَقْطُوعِ) **واتە: ئەو شتانەی كە بە دابڕاوی دەنووسرێت، نەك پیتەكان، وەكو:**

{ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ} البقرة ١٤٤.

(وَمَوْصُولٍ بِهَا) **یان پێكەوە دەنووسرێت لە قورئاندا وەكو:** {يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِي}طه٩٤ [1].

(وَتَاءِ أُنْثَى لَمْ تَكُنْ تُكْتَبْ بِهَا) **واتە: ئەو پیتانەی (ت) كە دەگەڕێتەوە بۆ مێینەو بەشێوەی (ـة)ی كۆتایی نەنووسراون لە قورئاندا وەكو: ( جنت، امرأت)**

(بِهَا) **واتە: بە (ها)، ئەم واتایەش دواتر شی دەكەینەوە.**

**واتای گشتی:**

**ئەو وشە دابڕاو و پێكەوە لكاوانەی كە لە قورئاندا هاتوون، هەروەها نووسینی پیتی (ت) وەكو نووسینی پیتی (ه) و دوو نوقتەی لەسەرە.**

٭٭٭

١ بڕوانە: الجامع في تجويد قراءة القران الكريم / كامل المسيري / ٢٤٩-٢٧٤ .

## بابەتی شوێنی دەرچوونی پیتەکان (مەخرەجەکان)
## بەشی یەکەم / پیتەکان

بێگومان ئەم بەشە گرنگترین بابەتە لە بواری تجویددا، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە دەیەوێت بەجوانی قورئان بخوێنێتەوە، شوێنی دەرچوونی پیتەکان بناسێت، بۆئەوەی وشەکانی قورئان بەڕاست و دروستی بخوێنێتەوە، هەربۆیە (إبن الجزري) فەرموویەتی:

إذْ واجِبٌ عَلَيهِمْ مُحَتَّمِ ... قَبلَ الشُّرُوعِ أوَّلاً أنْ يَعلَمُوا

**پیتەکان:**

پیت بریتیە لە دەنگێك پشت دەبەستێت بە شوێنێکی دیاری کراو، یان نادیار.

ئەوەی کە دیاری کراوە لەڕێگەی بەشێك لە بەشەکانی گەروو و زمان و لێوەوە دەردەچێت، نادیارەکانیش ئەو پیتانەن کە دەرچوونیان پەیوەندی نیە بەم شوێنانەوە، ئەوانیش بریتین لە وشەکانی (ا، و، ی) ئەم پیتانە پەیوەندیان بە هەناسەوە هەیە و، لەگەڵ تەواو بوونی هەناسە دەبڕێنەوە، وەکو دواتریش بە پشتیوانی خوای گەورە روونیان دەکەینەوە[1].

**بەشەکانی پیتەکان: دوو بەشن:** عەرەبی و ناعەرەبی، عەرەبییەکان سەرەکی و لاوەکین، سەرەکیەکانی (٢٩) پیتن بەلای زانایانەوە جگە لە (المبرد)، کە ئەو پێی وایە پیتەکان (٢٨) پیتن، چونکە ئەلیف و هەمزەی بە پیتێك داناوە، بۆچوونەکەشی -وەکو: (أسامة عبد الوهاب) دەڵێت:- بۆچوونێکی ناپەسەندە.

---

١ بڕوانە: الدرر البهية / ١٣.

پیتە لاوەکیەکانیش ئەوانەن کە لە دوو شوێنەوە دەردەچن، دابەش دەبن بۆ پاراوو ناپاراو،سەبارەت بە پاراوەکان پێنج پیتیان لە قورئاندا هاتووە.

**یەکەم:** هەمزەی ئاسانکراو (الهمزة المسهلة) ئەویش لەلای خۆیەوە دەبێتە (٣) بەشەوە، یان بەرەولای پیتی (ا) دەڕوات وەکو: پیتی (ءَاۤنذرتم)، یان بەرەو لای پیتی (ي) دەڕوات وەکو: (أئنك)، یان بەرەو (و) دەڕوات وەکو: (أؤنزل).

**دووەم:** ئەلیفی لارکراو، **واتە:** لەنێوان (ا) و (ی) دا، بەواتایەکیتر نە ئەلیفێکی تەواوە و نە یائێکی تەواوە، بەڵکو نزیکە لە پیتی (ي).

**سێیەم:** پیتی (ص) کە بۆنی (ز)ی لێبێت، **وەکو:** وشەی (الصراط)، ئەم کارەشیان بەهۆی نزیکی شوێنی دەرچوونی ئەو دوو پیتە ئەنجام داوە، بەهۆی ئەوەشەوە لە پیتەکانی (صفیر)ن، نمونەی ئەم حاڵەتە لە خوێندنەوەی پێشەوا (حمزة)دا هەیە.

**چوارەم:** پیتی (ي) کە بۆنی (و) ی لێدێت، **وەکو:** وشەی (غیض) و (قیل) لەکاتی (إشمام) کردنیاندا، بەپێی خوێندنەوەی (هشام) و (الکسائي).

**پێنجەم:** (ا) ی قەڵەو، کەبەدوای پیتێکی قەڵەودا بێت، چونکە لەوحاڵەتەدا لە پیتی(و) نزیك دەبێتەوە، **وەکو:** لە وشەی مەزنی (الله) کە لەپاش پیتێکەوە بێت سەر یان بۆری هەبێت، یان وەکو ئەوەی لە ڕیوایەتی (ورش)دا هاتووە لەڕێگەی (الأزرق)ەوە لە (نافع) **وەکو:** وشەکانی (الصلاة) و (الطلاق) و (الظلام)، ئینجا ئەوەش بزانە برای خوێنەر کە سەر و بۆریش بەهەمان شێوە دەبنە دوو بەشەوە: سەرەکی و لاوەکی؛ سەرەکیەکان بریتین لە سەر و بۆر و ژێر، لاوەکیەکانیش بریتین لە سەر وبۆری لار، **وەکو:** (بشرى) و (النار) و (الکافرین) لەلای ئەوانەی کە بە (إمالة) ئەو وشانە

دەخوێنن، هەروەها وەکو: (رحمة) و (نعمة) لەلای ئەوانەی کە لە ڕاوەستاندا کۆتایی ئەوجۆرە وشانە لار دەکەنەوە، واتە: (رحمي) و (نعمي)[1]... هتد.

لەم حاڵەتەدا دەبێتە سەروبۆرێکی لاوەکی نە بۆرێکی تەواوە، نە سەرێکی تەواوە، دووەمیش پیتی بۆنکراو وەکو: (قيل) و (غيض) لە ڕێڕەوی ئەوانەی کە (إشمام)ی دەکەن وەکو: (هشام) و (الكسائي)[2].

٭٭٭

[1] بۆ زانینی دەنگەکەی و ئەنجامدانی بەشێوەیەکی تەواو پێویستە لە مامۆستایەکی مۆڵەت پێدراو وەریبگریت و ببیبستی. ((م.دلێر گەرمیانی))

٢ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الدرر البهية شرح المقدمة الجزرية / ١٦.




٩. مَخَارِجُ الحُرُوفِ سَبْعَةَ عَشَرْ          عَلَى الَّذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ

(مَخَارِج) کۆیە، تاکەکەی (مخرج)ە واتە: ئەو جێگەی کە پیتەکەی لێوە دەردەچێت، لێرەشدا مەبەست لە (٢٩) پیتەکەی زمانی عەرەبیە.

(عَلَى الَّذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ) **واتە:** بەپێی هەڵبژاردنی ئەو شارەزایە-مەبەستی (الخليل بن أحمد الفراهيدي)یە.

### چۆن بزانین پیتێکی دیاری کراو جێگەی دەرچوونی کوێیە ؟

بۆ نمونە دەمانەوێ بزانین پیتی (ق) یان (ش) یان (ب) شوێنی دەرچوونی لەکوێیە پیتەکە (ساکن) بکە یان باشترە (مشدّد)ی بکەیت و هەمزەیەکیش بخەیتە پێشی، بۆنمونە: (أقّ)، (أشّ)، (أبّ)، لەکوێ دەنگ نەما ئەوە شوێنی دەرچوونی پیتەکەیە[1].

### واتای گشتی:

پیتەکانی زمانی عەرەبی لە (١٧) جێگەوە دەردەچن، بە پێی هەڵبژاردنی کەسێکی شارەزا و کارامەی وەکو: (الخليل بن أحمد الفراهيدي).

---

١ بڕوانە: جامع شروح المقدمة الجزرية / محمد بن يوسف / ٢٧.

## پیتەکانی (الجوف)[1]

١٠. فَأَلِفُ الجَوْفِ وأُخْتَاهَا وَهِـي        حُـرُوفُ مَـدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي

(فَأَلِفُ الجَوْف) **واتە:** جێگەی دەرچوونی پیتی (ا) بۆشایی نێو دەمە و،جێگەیەکی دیاری کراوی نیە.

(وأُخْتَاهَا) **واتە:** هەردوو پیتی (و) و (ي) ئەگەر زەنندار بن و، پێشی خۆیان لەجۆری خۆیان بێت، **واتە:** ئەگەر لەپێش (و) بۆر (ضمة) هاتبێت و، پێش (ي) ژێر (كسرة) هاتبێت.

**تێبینی:** پیتی (ا) هەمیشە زەنندار (ساكن)ەو، پێشی خۆی هەمیشە سەر(فتحة)ی هەیە نمونەی ئەو سێ پیتانە کە بە (حروف المد و اللین) دەناسرێن، ئەم سێ وشەیە(قَال) بۆ (ا)، (يَقُول) بۆ (و)، (قِيل) بۆ (ي).

هەرسێکەشی کۆبوونەتەوە لە وشەی{نُوحِيهَا} هود٤٩.

(لِلْهَوَاء) ئەو هەوای کەلەدەم دەردەچێت، کە بریتیە لە دەنگ.

(تَنْتَهِي) **واتە:** پیتەکانی مەد تەواو دەبن.

بۆیەش ناونراون (حروف المد واللین) بە درێژی و ئاسانی دەردەچن (اااا) (ووو) (ييي) چونکە شوێنی لێوەدەرچوونیان بلاوە، شوێنی دەرچوونی پیتیش کاتێك بلاو

---

١ الجوف، واتە: بۆشایی نێوان گەروو و دەم .

بێت دەنگ درێژ دەبێتەوە و بە سانایی دەردەچێت، ئەگەر تەنگیش بێت دەنگەکە بە فشار دەردەچێت[1].

واتای گشتی:

پیتەکانی (ا، و، ي) لە بۆشایی نێوان گەروو و ناودەمەوە دەردەچن، ئەمانەش تایبەتن بە پیتەکانی (مدّ)ەوە و، تاکو هەناسەش درێژ ببێتەوە بەردەوام دەبن.



مەخرەجی واوی مەددی



مەخرەجی یائی مەددی



مەخرەجی ئەلیف

١ بڕوانە: جامع شروح الجزرية / زكريا الأنصاري / ٢٨-٢٩.

# پیتەکانی گەروو

١١. ثُمَّ لأَقْصَى الحَلْقِ هَمْزٌ هَاءُ      ثُمَّ لِوَسْطِهِ فَعَيْنٌ حَـاءُ

مە

**مەخرەجی دووەم گەرووە، سێ مەخرەجی تێدایە و شەش پیتی لێوە دەردەچێت:**

**یەکەم: سەرووی قورگ کە دوورترین جێگە دەگرێتەوە لە کۆتایی قورگ و، نزیك سنگ دوو پیتی لێوە دەردەچێت (ء) و (ه).**

**دووەم: ناوەڕاستی گەروو.**

(ثُمَّ لِوَسْطِهِ فَعَيْنٌ حَـاء) **واتە: پیتەکانی (ع) و (ح)ی لێوە دەردەچێت.**

**واتای گشتی:**

**کۆتایی گەروو پیتەکانی (ء) و (ه)ی لێوە دەردەچێت، لە ناوەڕاستی گەروشەوە پیتەکانی (ع) و (ح) ی لێوە دەردەچێت.**

١٢. أَدْنَاهُ غَيْنٌ خَاؤُهَا وَالْقَافُ      أَقْصَى اللِّسَانِ فَوْقُ ثُمَّ الْكَافُ

**واتە: نزیك ترین جێگەی گەروو لە دەمەوە مەخرەجی پیتەکانی (غ) و (خ)ە، پێشخستنی پیتی (غ) لەسەر (خ) بۆچوونی پەسەندکراوی (سیبویە) و (الشاطبي)یە، خاوەنی هۆنراوەی جەزەریش لەسەر هەمان بۆچوونە[1].**


مەخرەجی (غ، خ)


مەخرەجی (ع، ح)


مەخرەجی (ء، ه)

✡✡✡

[1] بڕوانە: المنح الفكرية شرح المقدمة الجزرية / ملا علی القاري / ٤٩.

## پیتەکانی زمان

### مەخرەجی پیتی (ق):

کاتێك (إبن الجزري) لێبووییەوە لەباسکردنی مەخرەجی پیتەکانی گەروو، دەستی کرد بە باسکردنی مەخرەجەکانی زمان و پیتەکانی:

مەخرەجی یەکەم: سەرووی زمان (أقصى اللسان) **واتە**: کۆتاییەکەی لە نزیك گەرووەوە.

(لِلقَافِ) مەبەستی مەلاشووە.

(الکاف) **واتە**: ئەمیش مەخرەجی لە سەرووی زمانەوەیە.


مەخرەجی (ق)


مەخرەجی (ك)

واتای گشتی:

پیتەکانی (ق) و (ك) لە سەرووی زمانەوە لە لای مەلاشووەوە دەردەچن جێگەی (ك) نزمترە لە جێگەی (ق)، بەگشتی ئەو مەخرەجانەی لە زماندان (١٠) مەخرەجن و (١٨) پیتیان لێوە دەردەچێت بەم شێوەی خوارەوە[١].

١ بڕوانە: الواضح في أحكام التجويد / د.محمد عصام القضاة / ٣٢-٣٤.

١. سەرووی زمان: واتە: دوورترین جێگەی لە نزیك قورگ و مەلاشووی سەرەوەیە، پیتی (ق)ی لێوە دەردەچێت.

٢. سەرووی زمان: کەمێك لە خوار مەخرەجی (ق)ەوە لەلای مەلاشووی سەرەوە، لەناو دەمەوە نزیك ترە، پیتی (ك) ی لێوە دەردەچێت.

٣. ناوەڕاستی زمان لەگەڵ مەلاشوودا، سێ پیتی لێوە دەردەچێت (ج) و (ش) و (ي) بەمەرجێك پیتی (ي) مەددی نەبێت، واتە: بزواو بێت یان زەنندەدار (ساكن) بێت و پێش خۆی سەر(فتحة) ی هەبێت.

٤. یەکێك لە لێوارەکانی زمان لای ڕاست یان لای چەپ لەگەڵ ئەو دانانەی بەتەنیشتیەوەن لە دانەخڕێکانی سەرەوە یان بە بەکارهێنانی هەردوولا پێکەوە پیتی (ضاد)ی لێوە دەردەچێت دەرکردنیشی لەلای چەپەوە ئاسانترە و زۆرتر بەکاردێت، لەلای ڕاستیشەوە کەمتر و قورسترە چونکە لە لێواری زمان و ئەو دانانەی تەنیشتەوە دەردەچێت بەهۆی درێژی مەخرەجەکەیشیەوە چونکە لەخواروی لێواری زمان دەست پێ دەکات و لە سەرروویەوە تەواو دەبێت.

٥. خواروی هەردوو لێواری زمان بەرەو سەرەتای زمان لەگەڵ پووکی ددانەکانی تەنیشتی لەو مەخرەجەوە پیتی (ل) ی لێوە دەردەچێت.

٦. پێشەوەی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی بەرانبەرێتی لە پووکی ددانەکانی سەروە پیتی (ن) ی لێوە دەردەچێت.

٧. پێشەوەی زمان و کەمێك لە پشتیەوە لەگەڵ پووکی ددانەکانی تەنیشتی لەسەرەوە نزیك مەخرەجی (ن) لەو مەخرەجەوە پیتی (ر) دەردەچێت لاربونەوەیەکیشی تێدایە بەرەو مەخرەجی (ن).

٨. پشتەوەی زمان لەگەڵ پووکی ددانە بڕەرەکانی لای سەرەوە کە ئەوە خاڵی پەیوەندی نێوان بڕەرەکانی سەرەوەو پووکی ناو دەمە ئەوەش بریتیە لەمەخرەجی پیتەکانی (ت) و (ط) و (د).

٩. پێشەوەی زمان و سەرووی بڕەرەکانی خوارەوە لەگەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی کەم لەنێوان سەرەتای زمان و ددانەکان ئەم مەخرەجەش تایبەتە بە پیتەکانی (س) و (ز) و (ص).

١٠. پێشەوەی زمان و پێشەوەی ددانە بڕەرەکانی سەرەوە هاوکات دەرکردنی کەمێك لە زمان بۆ دەرەوەی ددانەکان ئەمەش پیتەکانی (ث) و (ذ) و (ظ)ی لێوە دەردەچێت.

✿✿✿

## پیتەكانی نێوان ناوەڕاستی زمان و مەلاشوو (الأحرف الشجْرية)

**مەخرەجی (ج) و (ش) و (ي):**

١٣. أَسْفَلُ وَالْوَسْطُ فَجِيمُ الشِّينُ يَا وَالضَّادُ مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا

١٤. لاضْرَاسَ مِنْ أَيْسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا وَاللاَّمُ أَدْنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا

(أَسْفَل) **واته: لەخوارووی پیتی (ق)ەوە، هەردوو پیتی (ق) و (ك) بەپیتی (لهوي) دەناسرێت، چونكە لەكۆتای زمانەوە دەردەچن لەلای زمانە بچكۆلەوە.**

(وَالْوَسْط) **ناوەڕاستی زمان لەگەڵ بەشی سەرووی مەلاشوو، مەخرەجی (ج) و ئینجا (ش) و ئینجا (ي) ی تێدایە.**

(وَالضَّادُ مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا) **واته: مەخرەجی (الـضَّـاد) لەلێواری زمانەوەیە**

(لاضْرَاس) **ددانە خرێكان** (مِنْ أَيْسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا) **واته: لەلای چەپی یا ن لای ڕاستیەوە كەئەمەیان كەم بەكاردەهێنرێت و گرانە لەوەش گرانتر دەركردنی ئەو پیتەیە لە هەردوولای زمانەوە.**

**واتای گشتی:**

**لە ناوەڕاستی زمانەوە مەخرەجی (ج) و (ش) و (ي)ی لێ دەردەچن، هەروەها پیتی (ض) یش لەلای زمانەوە دەردەچێت یان لای چەپی یان لای ڕاستی.**

سوود: محمد بن علی النویری لە کتێبی (شرح طیبة النشر) دەڵێت: دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت پیتی (الـضّـاد) ی لەهەردوو لای زمانیەوە دەردەکرد[1].


مەخرەجی یاءی (غیر مد)ی


مەخرەجی (ج)



مەخرەجی (ش)

٥٥٥

١ بڕوانە: شرح طیبة النشر ج١/٢٣٣.

## پیتەکانی سەر زمان

(وَالـلاَّمُ أَدْنَـاهَـا لِمُنْـتَـهَاهَا) **واتە:** پیتی (ل) لەنزیکترین لێواری زمانەوەیە لە دەم دەردەچێت لە دوای مەخرەجی (الـضَّـاد)ەوەیە لەگەڵ پووکی بەشی سەرەوەی ددانەکان هیچ پیتێکیش نیە-بەپێی بۆچوونی هەندێك لە زانایان- مەخرەجەکەی ئەوەندەی مەخرەجی (ل) درێژ بێت، دەرچوونی پیتی (ل) لەلای چەپەوە- بەپێچەوانەی پیتی (ض)- کەمتر و گرانترە بەڵام لەلای ڕاستەوە زۆرتر و ئاسانترە.



مەخرەجی (ل)



مەخرەجی (ض)

**مەخرەجی (ن):**

١٥. وَالنُّونُ مِنْ طَرْفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا وَالرَّا يُدَانِيهِ لِظَهْرٍ أَدْخَلُوا

لێرەدا (إبن الجزري) تێمان دەگەیەنێت کە مەخرەجی (ن) کەمێك لەپێشەوەی زمانەوەیە کەمێك بەرەو پشتی زمانە ئەوەش بەپێی بۆچوونی (سیبویە) و، ئەوانەی هاوبۆچوونن لەگەڵیدا[١].



مەخرەجی (ن)



مەخرەجی (ر)

٭٭٭

١ بڕوانە: لێکدانەوەی خالد الأزهري لە جامع الشروح / ٣٣.

## پیتەکانی پێشەوەی مەڵاشوو
## (الحروف النطعية)

١٦ . وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا مِنْهُ وَمِنْ     عُلْيَا الثَّنَايَا والصَّفِيْرُ مُسْتَكِنْ

**(وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا) ئەم پیتانەش لەپێشەوەی زمان و ئاسمانەی دەمەوە دەردەچێت لەگەڵ بەکارهێنانی بنی ددانەکانی سەرەوە، ئەم سێ وشەش بە (الحروف النطعية) دەناسرێن چونکە لە چاڵایی مەڵاشووەوە دەردەچن.**

**(الثَّنَايَا) واتە: ددانەکانی پێشەوە دوو لەسەرەوە و دوو لەخوارەوە**

**(والصَّفِيْرُ مُسْتَكِنْ) واتە: پیتەکانی (ص) و (ز) و (س) جێگیرە کە دەرچوونیان لەسەرەتای زمانەوەیە.**

واتای گشتی

**پیتەکانی (ت) و (ط) و (د) لەپێشەوەی زمان لەگەڵ بەکارهێنانی ددانەکانی پێشەوە بەشی سەرەوە دەردەچن هەروەها جێگیریش بووە پیتەکانی (صفیر)یش کە بریتین لە (ص) و (ز) و (س) لەهەمان جێگەوە دەردەچن بەڵام سەر زمان دەدات لە ددانەکانی خوارەوە.**

## پیتەكانی باریكایی زمان
## (الحروف الأسلية أو حروف الصفير)

١٧. مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى      وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا لِلْعُلْيَا

(مِنْهُ) **واتە: لە پێشەوەی زمان** (وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى) **واتە: لەنێوان ددانەكانی پێشەوە بەشی سەرەوە و خوارەوە ئەم سێ پیتەش بە (الحروف الأسلية) دەناسرێن چونكە لە (أسلة)ی زمانەوە واتە لە باریكایی زمانەوە دەردەچن.**

### ئەو پیتانەی لە نزیك پووكەوە دەردەچن (الحروف اللثوية)

(وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا لِلْعُلْيَا) **واتە: لەپێشەوەی هەردوو لای زمانەوە دەردەچن لەگەڵ ددانەكانی سەرەوە مامۆستایانی فێركردنی قورئان جەخت دەكەنەوە سەبارەت بەم پیتانە كە زمان دەریكرێت لەكاتی وتنیاندا، ئەم سێ پیتەش بە(اللثوي) دەناسرێن چونكە لە نزیك (پووك) گۆشتی دەوری ددانەكانەوە دەردەچن.**

**ئەم (٣) پیتە لەلایەن (الخلیل بن أحمد الفراهیدي) ناونراون بە (الحروف اللثوية) چونكە سەرەتا یان لەلای پووكەوە دەست پێ دەكات، یان وەكو: (التاذفي) دەڵێت: لەبەرئەوەی مەخرەجەكەیان نزیكی پووكە، یان لەبەر ئەوەی مەخرەجەكەیان لە لێوەوە دەردەچێت، ئەوەش وەسفێكی ڕاست نیە.**

(المرعشي) دەڵێت: ئەم واتایە جۆرێك لە چاوپۆشینی تێدایە، چونكە ئەو هەناسەی لەگەڵ دەربڕینی ئەم پیتانە دەردەچێت دەگاتە پووك و لەوێ بڵاودەبێتەوە، ڕاست تریش ئەوەیە بەم پیتانە بوترێت (أسناني) نەك (لثوي)[1].

واتای گشتی:

پیتەكانی (ظ، ث، ذ) لەپێشەوەی زمان و ددانەكانی پێشەوەی بەشی سەرەوە دەردەچن هاوكات لەگەڵ كەمێك لە دەركردنی زمان.



مەخرەجی (د، ت، ط)



مەخرەجی (س، ص، ز)



مەخرەجی (ذ، ث، ظ)

ooo

[1] بڕوانە: الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية / د.غانم قدوري الحمد / ٣٩-٤٠.

## پیتەکانی هەردوو لێو و کەپوو
## (حروف الشفتين الخيشوم)

١٨. مِنْ طَرَفَيْهِمَا وَمِنْ بَطْنِ الشَّفَهْ فَالْفَا مَعَ اطْرافِ الثَّنَايَا المُشْرِفَهْ

**(مِنْ طَرَفَيْهِمَا) واتە: لەهەردوولای زمانەوە پەیوەندی هەیە بە پیتەکانی باریکایی زمان.**

**(وَمِنْ بَطْنِ) واتە: بەشی ناوەوەی لێوی خوار.**

**(فَالْفَا مَعَ اطْرافِ الثَّنَايَا المُشْرِفَهْ) واتە: پیتی (ف) لە بەشی ناوەوەی لێوی خوار لەگەڵ پێشەوەی ددانە بڕەرەکانی سەرەوەدا[1].**

**واتە: پیتی (ف) لە بەشی ناوەوەی لێوی خوار دەردەچێت لەگەڵ خوارەوەی بڕەرەکانی سەرەوە[2].**

**تێبینی: هەندێ کەس پیتی (ف) لە مەخرەجی هەڵەوە دەردەکەن، کاتێك پێشەوەی ددانەکانی سەرەوەیان دەخەنە سەر لێوی خواریان نەك بەشی ناوەوەی.**

١٩. لِلشَّفَتَيْنِ الْوَاوُ بَاءٌ مِيْمُ وَغُنَّـةٌ مَخْرَجُهَا الخَيْشُومُ

**(لِلشَّفَتَيْنِ الْوَاوُ بَاءٌ مِيْمُ) واتە: مەخرەجی نێوان هەردوو لێو پیتی (و، ب، م)ی لێوە دەردەچێت، بەڵام بۆ (و) لێوەکان دەکرێنەوە و خڕ دەکرێنەوە وەکو (ضمة) بخوێنیت و، بۆ پیتی (ب) و (م) دادەخرێن[1].**

---

١ بڕوانە: المنح الفكرية شرح مقدمة الجزرية /ملا علي القاري / ٥٨.

٢ بڕوانە: التجويد الميسر / د.عبد العزيز القاري / ٢٠.

(وغُنَّـةٌ مَخْرَجُـهَا الْخَيْشُومْ) **واتە: جێگەی دەرچوونی مینگەش کەپووە.**



مەخرەجی (ف)





مەخرەجی (م)



مەخرەجی (و) ی (غیر مد)ی



مەخرەجی (ب)

**واتای گشتی:**

**پیتەکانی (و، ب، م) لەنێوان هەردوو لێوەوە دەردەچن بۆ (و) بە کرانەوەیان و بۆ (ب، م) بە داخستنیان، مینگەش لە کەپووەوە دەردەچێت.**



مەخرەجی مینگە لەگەڵ (ن)



مەخرەجی مینگە لەگەڵ (م)

**سوود: مامۆستا (عطیة قابل نصر) دەڵێت:**

**پیتەکانی عەرەبی لە ڕووی مەخرەجیانەوە ژمارەیان (٣١) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**بۆشایی نێوان قوڕگ و دەم: ٣ پیت.**

**قوڕگ: ٦ پیت.**

**زمان: ١٨ پیت.**

**هەردوو لێو: ٤ پیت[٢].**

---

١ بڕوانە: هدایة المستفید / محمد محمود ابو ریمة / ٢٩.

٢ بڕوانە: غایة المرید في علم التجوید/ عطیة قابل نصر / ١٢١-١٢٢.

## سیفەتی پیتەکان

(الصفات) کۆیە تاکەکەی (صفة)یە لە ڕووی زمانەوانیەوە واتە: ئەو واتایەی کە وەسفی شتێك دەکات وەکو بڵێی ئەو شتە سپیە یان ڕەشە.

لەڕووی (إصطلاحي)یەوە بریتیە لە شێوازێکی نەگۆڕ (ثابت) بۆ پیتەکە لەکاتی خوێندنەوەیدا وەکو: دەنگ نەرم کردن و نزم کردن و بەرزکردن، لەڕاستیدا سیفەتەکان وەکو پێوانەن بۆ پیتەکان، پیتی بەهێز لە لاواز جیادەکەنەوە وەکو: (ت) لە (ط) چونکە ئەگەر سیفەتی لکاندن (الإطباق) و جووڵاندن (قلقلة) نەبوایە لە یەکتر جیا نەدەکرانەوە.

بۆیە خستنە ڕووی سیفەتەکان شێوازی ڕاستی خوێندنەوەی پیتەکان دەردەخات وەکو ئەوەی ئایا دەنگ بەو پیتە درێژ دەبێتەوە یان نا.

زانینی ئەو سیفاتانە سێ سوودی هەیە:

یەکەم: جیاکردنەوەی ئەو پیتانەی کە مەخرەجی هاویەشیان هەیە.

دووەم: ناسینی پیتی بەهێزولاواز، بۆ ئەوەی بزانرێت ئایا دروست تێهەڵکێش (أدغام) کراوە یان نا دروست.

سێیەم: جوان خوێندنەوەی ئەو وشانەی کە مەخرەجەکانیان جیاوازن[1].

### جیاوازی زانایان سەبارەت بە ژمارەی سیفەتەکان

زانایان لەم بارەیەوە جیاوازیان لەنێواندایە، (إبن الجزري) و ئەوانەی پەیڕەوی لە بۆچوونەکەی دەکەن پێیان وایە کە (١٧) سیفەتن، بەلای هەندێ زانایانیشەوە (٢٠)ە یان (٣٤)ە یان (٤٤)ە بەڵام ئێمە لەم کتێبەدا ڕەچاوی بۆچوونی جومهوری زانایان

---

١ بڕوانە: الدرر البهية / ٢٥.

دەکەین، کە (إبن الجزري)یش هەمان بۆچوونی هەیە لەوەی کە **سیفەتەکان بریتین لە (١٧) سیفەت و دەڵێن:**

**سیفەتەکان دەبنە دوو بەشەوە:**

١. سیفەتە خۆییەکان (الصفات الذاتية).

٢. سیفەتە توشهاتووەکان (الصفات العرضية).

سیفەتە خۆییەکان: ئەو سیفەتانەن کە هۆگرن بە پیتەکەوە و هەرگیز لێی جیانابنەوە وەکو: (قلقلة).

سیفەتە توشهاتووەکان: ئەو سیفەتانەن کە هەندێ جار لەگەڵ پیتەکەن و هەندێ جار لێی جیادەبنەوە وەکو: (تفخيم) و (ترقيق)، لێرەدا باسمان لەسەر بەشی یەکەمە، **کەئەویش دەبێتە دوو بەشەوە:**

١. ئەو سیفەتانەی کە دژیان هەیە.

٢. ئەو سیفەتانەی کە دژیان نیە.

**سیفەتە دژە یەکترەکان بریتین لە:**

(الجهر) دژەکەی (الهمس)ە.

(الرخاوة) دژەکەی (الشدة) و (التوسط)ە.

(الإستفال) دژەکەی (الإستعلاء)ە.

(الإنفتاح) دژەکەی (الإطباق)ە.

(الإصمات) دژەکەی (الإذلاق)ە.

**سیفەتە بێ دژەکانیش بریتین لە:**

(القلقلة) و (اللين) و (الإنحراف) و (التكرير) و (التفشي) و (الإستطالة)، دواتریش هەموو ئەم سیفەتانە باس دەکەین و واتاکانیان ڕوون دەکەینەوە (إن شاءالله)[١].

(إبن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێبێت بەباسکردنی سیفەتە بەناوبانگەکان دەست پێدەکات و دەڵێت:

۞۞۞

١ بڕوانە: الدرر البهية / ٢٦.

## سیفەتە دژ دارەکان

٢٠. صِفَاتُهَا جَهْرٌ وَرِخْوٌ مُسْتَفِلْ مُنْفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ وَالضِّدَّ قُلْ

**(صِفَاتُهَا) واتە: سیفەتە بەناوبانگەکانیان بریتین لە:**

١. **(جَهْرٌ) واتە: دەنگ بەرزی.**

٢. **(وَرِخْوٌ) واتە: نەرمی.**

٣. **(مُسْتَفِلْ) واتە: نزم.**

٤. **(مُنْفَتِحٌ) واتە: کراوە.**

٥. **(مُصْمَتَةٌ) واتە: قورس.**

**(وَالضِّدَّ قُلْ) واتە: باسی دژەکانیشیان بکە، کە بریتین لە:**

٦. **(الهمس) واتە: ئەسپایی.**

٧. **(الشدة) واتە: توند و بەهێز.**

٨. **(الإستعلاء) واتە: بەرزی.**

٩. **(الإطباق) واتە: لکاندن.**

١٠. **(الاذلاق) واتە: خێرایی.**

## پیتەکانی نەسپایی و دەنگ بەرزی و توندی و نەرمی

٢١. مَهْمُوسُهَا (فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ)   شَدِيدُهَا لَفْظُ (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ)

ئەمەش پوختەی واتاکانی ئەو سیفاتانەیە کە باسمانکرد:

(الهمس):

لەڕووی زمانەوانیەوە: دیارنەبوون و نەسپایی.

لەڕووی زاراوەوە: دەرچوونی هەناسە لەکاتی دەربڕینی ئەو پیتانەی کە ئەم سیفەتەی تێدایە، بەهۆی لاوازی پشت بەستن بە مەخرەجەکەیەوە.

پیتەکانی: (١٠) پیتن کۆ کراونەتەوە لە وتەی (ابن الجزري) دا، (فحثه شخص سكت)[1].

**تێبینیەکی گرنگ:** خوێنەر ناتوانێت-ئەم سیفەتە-یان هەر سیفەتێکی تر- لە کتێبەکانەوە فێر بێت، بەڵکو پێویستە لە مامۆستای کارامەوە فێربێت، بەتایبەتی لەو مامۆستایانەی شارەزایی تەواویان هەیە لە شێوازی خوێندنەوەی قورئان و سەنەدی نە پچڕاویان هەیە بۆ لای پێغەمبەر ( )[2].

(الجهر):

لەڕووی زمانەوانیەوە: ئاشکراکردن.

---

١ بڕوانە: الميسر الفريد في علم التجويد / محمد فريد الجمل / ٨٠.

٢ بڕوانە: الدرر البهية / ٢٧.

لەڕووی زاراوەوە: دەرنەچوونی هەوا لە کاتی دەربڕینی پیتەکە، بەهۆی تەواو پشت بەستن بە مەخرەجەکەیەوە.

**پیتەکانی:** بریتین لە پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتەکانی (الهمس) کۆکراوەتەوە لەم بڕگەیەدا (عظمِ وزن قاري ذي فض جد طلب) واتە: تای تەرازوەکەی قورسە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێت تەماشای حەرام ناکات و هەوڵ دەدات فێری زانست بێت[١].

(الشدة):

لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: بەهێزی.

لەڕووی زاراوەوە: واتە: ڕێنەکردنی دەنگ و گیرانی لەکاتی دەربڕینی پیتەکە بەهۆی ئەوپەڕی پشت بەستن بە مەخرەجەکەیەوە.

**پیتەکانی:** بریتین لە (٨) پیت (إبن الجزري) لەم ڕستەدا کۆیکردوەتەوە، (أَجِـدْ قَـطٍ بَكَتْ).

○○○

١ بڕوانە: الواضح في أحكام التجويد / د.عصام القضاة / ٤٥.

# پیتە مام ناوەند و بەرزەكان

٢٢. وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ (لِنْ عُمَرْ) وَسَبْعُ عُلْوٍ (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) حَصَرْ

(وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ) **واتە: لەنێوان پیتە بەهێزەكان و پیتە نرمەكاندا (٥) پیت هەیە لە (لِنْ عُمَرْ)دا كۆكراونەتەوە.**

## پیتە مام ناوەندەكان

**(التوسط):**

**لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: مام ناوەندی.**

**لەڕووی زاراوەوە: واتە: دەنگ تێیاندا نەبەتەواوی دەگیرێت وەكو پیتە بەهێزەكان و، نەبەتەواویش ڕێ دەكات وەكو پیتە نەرمەكان هەندێ لە زانایانیش بە پیتەكانی (البينية) ناوی دەبەن.**

۞۞۞

## پیتە نەرمەکان (الحروف الرخوة)

لەڕووی زمانەوانیەوە: **واتە:** نەرمی.

لەڕووی زاراوەوە: **واتە:** ڕێکردنی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکە بەهۆی لاوازی پشت بەستن بە مەخرەجەکەی.

**پیتەکانی (١٨) پیتن:** (ث، ح، خ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ظ، غ، ف، هـ، و، ي، ا، و (مەددی)، ی (مەددی) ).

پیتەکانی زمانی عەرەبی دابەشکراونەتە سەر ئەم سێ سیفەتە، پیتەکانی (أَجِدُ قَطٍ بَكَتْ) بە پیتە بەهێزەکان دەناسرێن و پیتەکانی (لِنْ عُمَرْ) بەپیتە مامناوەندەکان دەناسرێن و ئەوەشی لەو دوو جۆرە نەبێت بەپیتی نەرم دادەنرێت[1].

**بۆنمونە-** مامۆستا (أیمن سوید) دەڵێت:

لەکاتی دەربڕینی پیتی (ش) دەبینین دەنگی پیتەکە درێژ دەبێتەوە، (أشششـ) یان (أغغغـ) بەڵام لە پیتێکی **وەکو:** (ب) بەهیچ شێوەیەك درێژ نابێتەوە (أبّ)، لەنێوان ئەم جۆرە پیتانەدا (لِنْ عُمَرْ)ی مامناوەند هەیە، **بۆنمونە:** پیتی (ع) نە وەکو (ش) و (غ) درێژ دەبێتەوە، نە وەکو (ب) ڕادەوستێت، بەڵکو حاڵەتێکە لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدایە[2].

(وَسَبْعُ عُلْوٍ) **واتە:** پیتە بەرزەکان (٧) پیتن.

---

١ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣١-١٣٢.

٢ لە یەکێك لەو وانانەی (د.أیمن)دا دەربارەی سیفەتی پیتەکان هاتووە لە کەناڵی (إقرأ).

(خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) واتە: پیتە بەرزەکان کۆبونەتەوە لەم وشانەدا (حصر) تەنها لەم ڕستەدا کۆبوەتەوە و لەوە زیاتر نین.

(الإستعلاء):

لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: بەرزبوونەوە.

لەڕووی زاراوەوە: واتە: ئاراستەی فشاری دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکە بەرەو سەرووی مەلاشوو لەگەڵ بەرز بوونەوەی بەشێك لە زمان بەرەو مەلاشوو.

پیتەکانی (الإستعلاء) بریتین لە: (خ، ص، ض، غ، ط، ق، ظ)، بەلاّم پیتە بەرزەکان هەموو وەکو یەك نین لەبەرزیاندا بەڵکو پێنج پلەیان هەیە:

١. پیتی بەرز ئەگەر سەر (فتحة)ی هەبێت و پیتی (ا)ی بەدوادا بێت وەکو: (قال).

٢. پیتی بەرز ئەگەر سەر (فتحة)ی هەبێت و پیتی (ا)ی بەدوادا نەیەت وەکو: (قَدْ).

٣. پیتی بەرز کە بۆر (ضمة)ی لەسەر بێت وەکو: (يقولوا).

٤. پیتی بەرز ئەگەر زەنەدار (ساكن) بێت، وەکو: (يقطعون) و (يختصمون) و (نصبر).

٥. پیتی بەرز ئەگەر ژێر (كسرة)ی هەبێت، وەکو: (قيل)[1].

---

١ بڕوانە: النور المبين في تجويد القران الكريم / محاضرة د. أيمن سويد / ٢٢.

زۆریەی زمانیش لەکاتی دەربڕینی پیتی (ط) بەرز دەبێتەوە، پاشان (ص) و (ض) و (ظ) تاکو دەگاتە پیتی (ق) کەزمان کەمتر بۆ دەربڕینی بەرز دەبێتەوە، لەوەش کەمتر لە دەربڕینی هەردوو پیتی (خ) و (غ).

لەبەر ئەوەش ناونراوە (إستعلاء) چونکە دەنگەکە لە بەرزاییەوە دەردەچێت. (المرعشي) دەڵێت: لە پیتە بەرزەکاندا گرنگ ئەوەیە سەرووی زمان بەرز بێتەوە، ئیتر گرنگ نیە ئەودوای زمان بەرز بێتەوە یان نا[1].

لەڕاستیدا یەکێك لە گرنگ ترین هۆکارەکانی جوان خوێندنەوەی قورئان ناسینی پیتە بەرزەکان و پایەکانیان و جێبەجێکردنیانە لەکاتی خوێندنەوەیاندا، ئەمەش بەهەمان شێوە مەسەلەیەك نیە لەکتێبەوە وەربگیردرێت، بەڵکو پێویستە لە مامۆستای لێهاتوو وەربگیردرێت.

٭٭٭

---

١ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣٢.

## پیتە نزمەکان (حروف الإستفال)

(الإستفال):

لەڕووی زمانەوانیەوە: **واتە**: نزمی.

لەڕووی زاراوەوە: **واتە**: نزم بوونەوەی زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکەو، بەرز نەبوونەوەی بەرەو ئاسمانەی دەم (مەلاشوو) لەو کاتەدا.

پیتەکانی: بریتین لە (٢٢) پیت، **واتە**: پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتە بەرزەکان (ء – ب – ت – ث – ج – ح – د – ذ – ر – ز – س – ش – ع – ف – ك – ل – م – ن – هـ – و – ي – ا).

### پێوەری جیاکردنەوەی پیتی بەرز و نزم

جیاکردنەوەی پیتی بەرز و نزم بە بەرزبوونەوەی زمان دەناسرێت لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا، لەگەڵ هەرپیتێکدا زمان بەرز بوویەوە ئەوا پیتێکی بەرزە، لەگەڵ هەرپیتێکدا زمان نزم بوویەوە ئەوا پیتێکی نزمە.

**نموونەی پیتی بەرز** : (أطّ) (أقّ) (أظّ) لە دەربڕینیاندا زمان بەرز دەبێتەوە.

**نموونەی پیتی نزم**: (أهّ) (أشّ) (أتّ) لە دەربڕینیاندا زمان نزم دەبێتەوە.

پیتە نزمەکانیش بەهەمان شێوە پیوەرێکی زۆر گرنگن بۆ جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، بەتایبەتی لەکاتی یەککگرتنیان لەگەڵ پیتە بەرزەکاندا لە وشەیەکدا، **وەکو**: (مخمصة) و (أخذن)، فێربوونیشیان لەڕێگەی کتێبەوە نابێت بەڵکو دەبێت لەڕێگەی مامۆستای شارەزاوە بێت لەو بوارەدا.

**واتای گشتی:**

**هەندێ لەپیتەکان سیفەتی نەرم (رخاوة)یان تێدایە و هەندێکیان سیفەتی بەهێزیان تێدایە، لەنێوان ئەو دوو جۆرەشدا هەندێ پیتی تر هەیە مام ناوەندن و پیتەکانی قەتیس بوونە لە ڕستەی (لِنْ عُمَر).**

**هەروەها لەناو پیتەکانی عەرەبیشدا (٧) پیتی بەرز هەن پێویستە لەکاتی دەربڕینیاندا بەشێك لە زمان بەرزبێتەوە بەرەو ئاسمانەی دەم.**

○○○

## پیتەکانی لکاندن (الإطباق)

٢٣. وَصَادُ ضَادُ طَاءُ ظَاءُ مُطْبَقَة     و (فِرَّ مِنْ لُبِّ) خُرُوفُ مُذْلَقَة

(وَصَادُ ضَادٌ طَاءُ ظَاءُ مُطْبَقَة) **واتە: ئەم چوار پیتە زمان یان بەشێك لە زمان لە کاتی دەربڕینیاندا دەلکێنە ئاسمانەی دەمەوە.**

**(الإطباق):**

لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: لکاندن.

**لەڕووی زاراوەوە: واتە:** لکاندنی **زمان یان بەشێك لە زمان لە کاتی دەربڕینیاندا بە مەلاشووەوە و، لە کاتی دەربڕینیاندا بە شێوەیەك دەنگ پەنگ دەخواتەوە لەنێوانیاندا پیتەکانیشی بریتین لە (ص، ض، ط، ظ) زمانیش وەکویەك لەهەموو پیتەکاندا نالکێت بە مەلاشووەوە.**

**سوود: هەموو پیتێکی (إطباق) بەرزە، بەلام مەرج نیە هەموو پیتێکی بەرز زمان لەدەربڕینیاندا بلکێت بە مەلاشووەوە[1].**

**(الإنفتاح):**

**لەڕووی زمانەوانیەوە:** واتە: **جیابوونەوە.**

**لەڕووی زاراوەوە: واتە: ئەو پیتانەیە کە لەکاتی دەربڕینیاندا زمان و مەلاشوو لە یەکتر دوور دەکەونەوە تاکو هەوا لە نێوانیاندا دەربچێت[2].**

---

**١ بڕوانە: الواضح في أحكام التجويد / د.عصام القضاة/٤٧.**

٢ بڕوانە: البرهان في تجويد القرآن / الصادق القمحاوي/ ١٧.

(فَرَّ مِنْ لُبّ) الحروف المذلقة:

**واتە:** پیتی خێرا (مذلق)، بریتین لەو پیتانەی خۆیان لە ڕستەی (فَرَّ مِنْ لُبّ) دا دەبیننەوە واتە: (ف – ر – م – ن – ل – ب).

(الإذلاق):

لەڕووی زمانەوانیەوە: **واتە:** پەڕ یان لای شتێك.

لەڕووی زاراوەوە: **واتە:** سووکی پیتەکە یان خێرایی دەربڕینی چونکە لە پێشەوەی زمان یان یەکێك لە لێوەکان یان لە هەردووکیانەوە دەردەچن، پیتەکانیشی وەکو باسمان کرد (٦) پیتن، هۆی ناونانیشی بە (إذلاق) ئەوەیە کە هەندێکیان لە پێشەوەی لێوەوە دەردەچێت[١].

(الإصمات):

لەڕووی زمانەوانیەوە: **واتە:** قەدەغەکردن.

لەڕووی زاراوەوە: **واتە:** قورسی پیتەکە لەکاتی دەربڕیندا، (الأخفش) **وتوویەتی:** ئەو کەسەی (صمت) بکات، **واتە:** خۆی لە قسەکردن قەدەغە کردووە، مەبەستیش لەوەیە کە ئەم پیتانە قەدەغەن لەوەی کە خۆیان بە تەنها وشەی چوار پیتی یان پینج پیتی پێکبهێنن، بەڵکو پێویستە پیتێکیان لەگەڵدا بێت لە پیتە (مذلق)ەکان هەر بۆیە زانایان وتوویانە وشەی (عسجد) **واتە:** ئاڵتوون وشەیەکی عەرەبی نیە چونکە چوار پیتە و پیتی خێراشی لەگەڵدا نیە[٢].

---

١ بڕوانە: الدرر البهية شرح المقدمة الجزرية / ٣١.

٢ بڕوانە: المنح الفكرية في شرح المقدمة الجزرية / ملا علي القاري / ٧٢.

**پیتەکانی:** هەموو پیتەکانی زمانی عەرەبیە جگە لە پیتە خێراکان واتە (٢٣) پیتە کۆکراونەتەوە لەم ڕستەدا (جز غش ساخط صيد ثقة اذ وعظه يحضك)[١]. **واتە:** دووربە لە فرۆفێلی کەسێك کە ڕقی لە حەقە و بگەڕێ بەدوای کەسێکی متمانە پێکراو چونکە ئامۆژگاریەکانی هانت دەدەن بۆ چاکە.

واتای گشتی:

**پیتەکانی لکاندن (الإطباق) چوار پیتن (ص، ض، ط، ظ).**

**پیتەکانی خێرایی (الإذلاق)یش شەش پیتن (ف – ر – م – ن – ل – ب).**

٭٭٭

---

١ بڕوانە: الميسر الفريد في علم التجويد / محمد فريد الجمل / ٨٣.

## سیفەتە بێ دژەکان

٢٤. صَفِيرُهَا صَادٌ وَزَايٌ سِينُ  قَلْقَلَةٌ (قُطْبُ جَدٍ) واللِّينُ

### سیفەتی یەکەم (الصفير)

لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: دەنگێك وەکو دەنگی باڵندە بێت.

لەڕووی زاراوەوە: واتە: دەنگێکی زیادە لە لێوەوە هاوكات لەگەڵ پیتەکانی (ص، س، ز) دەردەچێت، بەهێزترینی ئەم سێ پیتەش (ص)ە، چونکە هەردوو سیفەتی (الإستعلاء) و (الإطباق)ی تێدایە[1]، پاشان پیتی (ز) کە سیفەتی (جهر)ی تێدایە بەڵام پیتی (س) لەو دوو پیتە لاوازترە چونکە سیفەتی (همس)ی تێدایە.

سوود: زانایان فەرموویانە، پیتی (ص) لە دەنگی قاز دەچێت و پیتی (ز) لەدەنگی مێشەنگ دەچێت و پیتی (س) لە دەنگی کوللە دەچێت[2].

### سیفەتی دووەم (القلقلة)

لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە: جووڵە.

لەڕووی زاراوەوە: واتە: درووست بوونی جووڵەیەك لە مەخرەجی پیتەکە لەکاتی دەربڕینیدا، ئەگەر پیتەکە ڕاوەستاو (ساكن) بێت دەنگێکی توندیش دەبیسترێت لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا[3].

---

١ بڕوانە: البرهان في تجويد القران / الصادق القمحاوي/ ١٧.

٢ بڕوانە: نهاية المفيد في علم التجويد / ٥٣، بەوەرگرتن لە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر/١٣٥.

٣ بڕوانە: أحكام التجويد و التلاوة / محمود رأفت زلط /٦٢.

پیتەکانی: (القلقلة) یان (لقلقة) پێنج پیتی هەیە پێشەوا (إبن الجزري) کۆیکردووەتەوە لە وشەی (قطب جد)، تێبینیش دەکرێت کە هەموو پیتەکانی سیفەتی (شدة) و (جهر) یان تێدایە.

بەشەکانی:

(قلقلة) دەبێتە سێ بەشەوە:

١. بەهێز ترین حاڵەتەکانی ئەوەیە پیتەکە شەددە دار بێت و لەکۆتایی وشەشدا هاتبێت وەکو: (الحقّ) و (تبّ) و ( الحجّ)، ئەم حاڵەتەش قەلقەلەی گەورە (القلقلة الكبرى) ی پێدەوترێت.

٢. پیتەکە زەنەدار (ساکن) بێت وشەددەی نەبێت لەکاتی وەستان لەسەری وەکو: (قريب)، (مجيد)، (خلق) ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێت قەلقەلەی مام ناوەند (القلقلة الوسطى).

٣. پیتی زەنەدار لەناوەڕاستی وشەوە وەکو: (يدخلون)، (وجهها)، (يطبع) ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێت قەلقەلەی بچوك (القلقلة الصغرى)[1].

هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان وەکو (عطية قابل نصر) پێی وایە کە (قلقلة) بەشی چوارەمیشی هەیە کاتێك پیتەکە بزواو (متحرك) بێت، لەو حاڵەتەشدا بنچینەی قەلقەلەی هەر تێدا دەمێنێت وەکو: (المتقين)[2].

(قلقلة) لەڕووی خودی پیتەکانەوە دەبێتە سێ ئاستەوە:

---

١ بڕوانە: الواضح في أحكام التجويد / د.عصام القضاة / ٤٩.

٢ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣٦.

**ئاستی یەکەم:** لە پیتی (ط) (قلقلة) بەرزتر دەبێت لە پیتەکانی تر.

**ئاستی دووەم:** لە پیتی (ج) (قلقلة) مام ناوەند دەبێت.

**ئاستی سێیەم:** (قلقلة) کەمتر دەبێت لەپیتەکانی (ق – ب – د).

**دەربڕینی (قلقلة) چۆن دەبێت ؟**

زانا و قورئان خوێنی پایە بەرز (محمود خليل الحصري) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە کتێبی (أحكام قراءة القرآن) دا وتوویەتی: زانایان سەبارەت بە شێوازی دەربڕینی (قلقلة) جیاوازیان تێدایە، جومهوری زانایان لەسەر ئەو بۆچوونەن کە هەمیشە بەلای (فتحة)دا دەڕوات بەڕەهایی، ئیتر ئایا پیتی پێش خۆی بۆر(ضمة)ی هەبێت وەکو: (هلْ يُجْزون إلاّ ما كانوا يعملون)، یان سەر (فتحة)ی هەبێت وەکو: (فاولئك يدخلون الجنة) یان ژێر(كسرة) ی هبێت وەکو: (ولا تشطط).

هەندێکیش لە زانایان بۆچوونیان وایە دەربڕینی پیتی (قلقلة) بەپێی بزوێنی پیش خۆیەتی واتە: ئەگەر بۆری هەبێت ئەوا بەرەو بۆر دەخوێنرێتەوە، ئەگەریش سەر یان ژێری هەبێت ئەوا بەرەو لای ئەو دووانە دەڕوانێت، بەڵام ئەوەی زۆرینەی مامۆستایانی ئەم هونەرەی لەسەرە ڕێڕەوی یەکەمە کە هەمیشە پیتی (قلقلة) بەرەو سەر دەڕوات.

**وەکو لە هۆنراوەی یەکێك لە زانایان هاتووە:**

**وقلقلة قرب الى الفتح مطلقا ولا تتبعها بالذى قبل تقبلا**

**واتە:** پیتەکانی (قلقلة) هەمیشە لە (فتحة) نزیك دەکرێنەوە، مەیانکە بە پاشکۆی پیتەکانی پێش خۆیان بۆئەوەی خوێندنەوەکەت پەسەند بێت.

مامۆستا (محمود علي بسه)یش لەکتێبی (العميد) لاپەڕە ٦٤ **وتوویەتی:**

وتراوە کە (قلقلة) هەمیشە لە سەر نزیککراوەتەوە بەبێ تەماشاکردنی پیتەکانی پێش و پاش خۆی، منیش ئەم بۆچوونە پەسەند دەکەم و بە باشی دەزانم کاری پێ بکرێت[1].

**واتای گشتی:**

پیتەکانی (صفیر) بریتین لە (ص، ز، س) و پیتەکانی (قلقلة)ش بریتین لە (ق، ط، ب، ج، د).

## سیفەتی سێیەم (اللین)

٢٥. وَاوٌ وَيَاءٌ سَكَنَا وَانْفَتَحَا     قَبْلَهُمَا وَالانْحِرَافُ صُحِّحَا

**(واللين) واتە:** پیتەکانی لین بەبێ (مەددن)، (وْ) و (يْ) ئەگەر زەننەدار (ساکن)بن و پیتی پێش خۆیان سەر(فتحة) ی هەبێت.

**پێناسەی (لین):**

لەرووی زمانەوانیەوە: **واتە:** ئاسانی، لووسی.

لەرووی زاراوەوە: **واتە:** دەرکردنی پیتەکە لە مەخرەجەکەیەوە و بەئاسانی و بەبێ هیچ قورسیەك لەسەر زمان.

**پیتەکانی:** دوو پیتن (يْ – وْ) بەمەرجێ ڕاوەستاو(ساکن) بێت و پیتی پێشی خۆیان سەری هەبێت (مفتوح) بێت وەکو: (قَول) و (صَيف) و(خوف).

---

[1] بڕوانە: الدرر البهية / ٣٣.

٢٦. فِي اللاَّمِ وَالرَّا وَبِتَكْرِيرٍ جُعِلْ وَلِلتَّفَشِّي الشِّيْنُ ضَادًا اسْتُطِلْ

پیتەکانی (إنحراف) و (تکریر) و (تفشی) و (استطالة) (والانحراف صححا) واته: جومهوری زانایان سیفەتی (الانحراف) یان بۆ هەردوو پیتی (ل) و (ر) جێگیر کردووە.

## سیفەتی چوارەم (الإنحراف)

لە زمانەوانیدا: واته: لادان.

لە زاراوەدا: لادانی پیتەکە لە مەخرەجەکەی.

پیتەکانی: (٢) پیتن (ل) و (ر).

لادان (الإنحراف) سیفەتێکی هۆگرە بۆ ئەو دوو پیتە، چونکە ئەو دوو پیتە لە مەخرەجی خۆیان دەرئەچن و دەگەنە مەخرەجی پیتێکی تر، (ل) لادەدا بۆ پێشەوەی زمان و (ر) یش لادەدا بۆ پشتی زمان[١].

## سیفەتی پێنجەم (التکریر)

لە زمانەوانیدا: واته: دووبارە بوونەوە.

لە زاراوەدا: واته: لەرینەوەی سەری زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکە، پیتەکەی تەنها پیتی (ر)ە.

(التکریر) سیفەتێکی وابەستەیە بە پیتی (ر)، چونکە ئەو پیتە ئامادەیە بۆ ئەو لەرینەوە بۆیە وریایی پێویستە لەکاتی دەربڕیندا، مەبەستیش لە باسکردنی ئەم سیفەتە خۆ لێ بەدوور گرتنێتی واته: زێدە ڕەوی نەکردن تێیدا، دەرکەوتنی ئەم سیفەتەش لە پیتی (ر) بەزۆری لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە (شدة) دار بێت وەکو:

---

١ بڕوانە: السعود في قراءة عاصم بن ابي النجود / حامد العاني / ٨٩.

(كرَّة) (مرَّة) بۆیە پێویستە لەسەر خوێنەر ئەو دووبارە بوونەوە بشارێتەوە و بواری دەرکەوتنی نەدات، بەڵام شاردنەوەی (تکریر)یش بەو شێوەیە نیە کە سەری زمان بەهیچ شێوەیەك نەجوڵێتەوە، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی پەنگ خواردنەوەی دەنگەکە لەنێوان سەری زمان و پوکدا وەکو: پیتی (ط)، ئەمەش هەڵەیەکە بواری پێ نەدراوە، بەڵکو پێویستە یەکجار سەری زمان بجوڵێتەوە بەسووکی بۆئەوەی سیفەتەکە بێتەدی[١،٢].

## چۆن لە دووبارەبوونەوەی پیتی (ر) خۆمان بپارێزین؟

ڕێگە چارەی ڕزگاربوون لەو هەڵەیە ئەوەیە خوێنەر پشتی زمانی بلکێنێ بە مەڵاشوویەوە بەشێوەیەك کە ڕێگە نەدات زمان زۆر بجوڵێتەوە[٣].

## سیفەتی شەشەم (التفشي)

لە زمانەوانیدا: واتە: بڵاوبوونەوە.

لە زاراوەدا: واتە: بڵاوبوونەوەی هەوا لە ناو دەمدا لەکاتی دەربڕینی پیتی (ش) هۆی ناونانیشی بە (متفشي) بڵاوبوونەوەی هەوایە لەناو دەمدا کە مەخرەجەکەشی دەگاتە مەخرەجی (ظ) بۆنمونە: (مما عُلِّمت رشدا)[٤].

ئەم سیفەتەش وەکو زۆرێك لە سیفەتەکانی تر ئاسان نی یە لەڕێگەی کتێبەوە لێی تێبگەی، بەڵکو فێربوونی پێویستە لەلای مامۆستا بێت.

---

١ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣٧.

٢ کەواتە پێویستە سیفەتی (تکریر) واتە: لەرینەوەی سەر زمان بێتەدی هاوکات لەگەڵ خۆپاراستن لە (تکرار). ((م.دلێر گەرمیانی))

٣ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣٨.

٤ بڕوانە: الجامع في تجويد قراءة القران الكريم / كامل المسيري / ١٤٩.

## سیفەتی حەوتەم (الإستطالة)

لە زمانەوانیدا: واتە: درێژبوونەوە.

لە زاراوەدا: واتە: درێژبوونەوەی دەنگ لەسەرەتای قەراغی لایەك لە زمانەوە تاکو کۆتاییەکەی.

**پیتەکەی:** ئەم سیفەتەش تەنها لە پیتی (ض) هەیە.

**ووریاکردنەوە:** (إبن الجزري) لە کتێبی (النشر في القراءات العشر) فەرموویەتی:

(ض) تاکە پیتێکە کە سیفەتی درێژ بوونەوەی تێدایە، هیچ پیتێکیش نیە ئەوەندەی (ض) قورس بێت لەسەر زمان، خەڵکیش لەشێوازی دەربڕینیدا هەمەجۆرن و کەم کەسیش بەباشی و دروستی دەریدەبڕێت، هەندێ وەکو (ظ) دەریدەبڕن و، هەندێ لەگەڵ پیتی (ذ) تێکەڵی دەکەن و،هەندێ دەیکەن بە (ل)ێکی قەڵەو و، هەندێکیش وەکو پیتی (ز)ی لێدەکەن و، هەموو ئەوانەش نادروستن[1].

**سوود:** دەنگ بە پیتی (ض) درێژ دەبێتەوە، بەڵام ناگاتە ئاستی درێژ بوونەوەی پیتی مەدد، چونکە (ض) لەمەخرەجی خۆیدا درێژ دەبێتەوە سنووری مەخرەجەکە نابەزێنێ.

بەڵام پیتی مەدد مەخرەجێکی دیاری کراوی نیە، بەڵکو دەنگی بە نەمانی هەناسە دەبڕێتەوە[2].

**زانیاری:** پیتی (ض) تەنها لە زمانی عەرەبیدا هەیە، هەربۆیە بە زمانی عەرەبی دەوترێت: (لغة الضاد).

---

١ بڕوانە: السعود في قراءة عاصم بن ابي النجود / حامد العاني / ٩٠-٩١.

٢ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد/ عطية قابل نصر / ١٣٨، المنح الفكرية شرح المقدمة الجزرية / ملا علي القارى / ٧٦.

بەڵام فەرموودەی (انا افصح من نطق الضاد) بنەمایەکی ڕاستی نیە، وەکو: (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا (١/٥٤) باسی کردووە.

**چۆن جیاوازی بکەین لە نێوان (ض) و (ظ) دا ؟**

هەندێ کەس پیتی (ض) وەکو پیتی (ظ) دەردەکەن، لەڕاستیشدا ئەم دوو پیتە لەڕووی مەخرەج و سیفەتەوە جیاوازییان لەنێواندایە. مەخرەجی (ض) یەکێکە لە قەراغەکانی زمان و، ئەو ددانانەی تەنیشتی لەلای سەرەوە، بەڵام مەخرەجی (ظ) لەپشتی سەرەتای زمانەوەیە لەگەڵ پێشەوەی ددانەکانی سەرەوە، ئەمەش جیاوازییەکی زۆرە لە نێوانیاندا لەڕووی سیفەتیشەوە هەردوو پیتەکە لە پێنج سیفەتدا هاوبەشن، کە بریتین لە سیفەتەکانی (الجهر) و (الرخاوة) و (الإستعلاء) و (الإطباق) و (الإصمات) بەڵام پیتی (ض) تاك دەبێتەوە بەسیفەتی (الإستطالة)، بۆیە پێویستە لەسەر خوێنەر ئەم دوو پیتە لە یەکتر جیا بکاتەوە، بە شێوەیەك درێژبوونەوەی پیتەکە ببیسترێت.

مامۆستا (حسني شيخ عثمان) لە کتێبی (حق التلاوة) لاپەڕە١٩٣ فەرموویەتی:

دەربڕینی پیتی (ض) وەکو پیتی (ظ) ئەگەر بوارێکی تێدا بێت چاوپۆشی لە کەسی نەخوێنەوارو نا شارەزا بکرێت، بەڵام هیچ بوارێکی تێدا نیە بۆ کەسێك کە توانای ڕاهێنانی زمانی هەبێت لەسەر دەربڕینی ئەو پیتە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و بێ تێکەڵبون لەگەڵ پیتی (ظ)، چونکە ئەو کارە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، ئەگەر واتایەکی نادروست بگەیەنێت جیاواز لەوەی خوای گەورە ویستوویەتی وەکو ئەو کەسەی (الضالّين) لە سورەتی (الفاتحة) بە (الظالين) دەخوێنێتەوە و، یان (ضل من تدعون) بە (ظل من تدعون) دەخوێنێتەوە، چونکە ئاشکرایە کە (ضل) واتای گومڕابوون دەگەیەنێت و، (ظل) بەردەوام بوون ومانەوە[١].

---

١ بڕوانە: حق التلاوة / حسني شيخ عثمان / ١٩٣ و بەوەرگرتن لە کتێبی ( الدرر البهية)/٣٨.

## بابەتی (التجويد)

لەڕاستیدا توێژینەوەی جێگەی دەرچوون و سیفەتی پیتەکان بە تەنها بەس نیە بۆ ئەوەی فێرخواز کارامە بکات لە دەربڕین و جوان خوێندنەوەی وشەکانی قورئان، چونکە یەکگرتنی پیتەکان پێکەوە کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەیە، لەوانەشە کەسێك بتوانێت پیتەکان بەجوانی دەربڕێت کاتێك تەنها بن، بەڵام لەکاتی پێکەوە بوونیان لە وشەیەکدا ئەوەی پێ ئەنجام نەدرێت. لەڕووناکی ئەم ڕاستیەشدا (الحسن بن قاسم المرادي) پێی وایە کە **تەجویدی قورئان لەسەر چوار مەسەلە بونیات نراوە:**

١. ناسینی مەخرەجی پیتەکان.

٢. ناسینی سیفەتەکانیان.

٣. زانینی ئەو حوکمانەی درووست دەبن لەئەنجامی پێکەوە بوونیان.

٤. ڕاهێنانی زمان و زۆر دوبارە کردنەوەی، بنچینەی هەموو ئەو مەسەلانەش ئەوەیە فێرخواز لەسەر دەستی مامۆستای کارامە فێری قورئان ببێت[١]، هەربۆیە کاتێك (إبن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێبێت تەواو بوو لە باسکردنی مەخرەج و سیفەتی پیتەکان، دەستی کردە باسکردنی ئەو مەسەلانەی لە دوای ئەوە پێویستن و فەرمووی:

---

١ بڕوانە: الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية / غانم قدوري الحمد/٢٧.

٢٧. وَالأَخْذُ بِالتَّجْوِيدِ حَتْمٌ لازِمُ     مَنْ لَمْ يُجَوِّدِ الْقُرَآنَ آثِمُ

٢٨. لأَنَّهُ بِهِ الإِلَهُ أَنـزَلاَ     وَهَكَذَا مِنْهُ إِلَيْنَا وَصَلاَ

(الاخذ بالتجويد) بایەخدان و کارکردن بە تەجوید (حتم لازم) زۆر گرنگە بۆ خوێنەری قورئان، پێویستە بیزانێ.

(من لم يجود القران آثم) هەرکێ قورئان بە پێی بنەماکانی تەجوید نەخوێنێتەوە گوناهبارە.

(لأَنَّهُ بِهِ الإِلَهُ أَنـزَلاَ ) واتە: چونکە خوای گەورە بەتەجویدەوە دایبەزاندووە، خوای گەورە فەرموویەتی: (ورتل القران ترتيلا)[1].

واتە: لەسەر خۆ و بەجوانی پیت و بزوێنەکانی بخوێنێتەوە، جەختیشی لەسەر مەسەلەکە کردووە بە وشەی (ترتيلا)[2].

(عبد الدائم الأزهري) وتوویەتی:

وەکو ئەوەی کەسێك پرسیاری لە (إبن الجزري) کردبێت: لەکوێوە دەزانین کە تەجوید پێویستە لەسەرمان و، واجبە فێری بین و، کەمتەرخەم تیایدا گوناهبارەو، بەڵگە چیە لەسەر هەموو ئەوانە و ڕێگەی فێربوونیشیان چۆنە؟ دانەریش لە وەڵامدا

---

١ بڕوانە: سورەتی المزمل /ئایەتی (٤).

٢ بڕوانە: نور الفلاح في تجويد كلام اللة الفتاح .

وتبێتی: (لأَنَّـهُ بِـهِ الإِلَـهُ أَنـزَلَا) **واتە: مەسەلەکە ئەوەیە خوای گەورە ئەو قورئانەی بە تەجویدەوە دابەزاندووە و فەرموویەتی: (ورتل القران ترتيلا)** [1].

(وهكذا منه الينا وصلا) **واتە: لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێك، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەك، بە (تواتر) پێمانگەیشتووە، لە ڕێگەی هاوەڵانەوە، ئەوانیش لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) لە ڕێگەی جبريل (عليه سلام)ەوە، ئەویش لە پەروەردگاری مەزنەوە)** [2].

۞۞۞

---

١ بڕوانە: الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية / غانم قدوري الحمد/٥٧.

٢ بڕوانە: اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / محمود محمد العبد .

## پێناسەی (تجوید)

لە زمانەوانیدا واتە: چاککردن، دەوترێت (هذا شيء جيد) واتە: ئەوە شتێکی چاکە.

لە زاراوەدا: واتە: شارەزابوون و کارامەیی لە خوێندنەوەی قورئاندا بەبێ زیادوکەم)[1].

یان بایەخدان بە هەموو پیتێك لە ڕووی جێگیری دەرچوون و سیفەت و مینگە و، درێژکردنەوە و بچوك و گەورە کردنەوە و...هتد)[2].

**ئامانج چیە لە شارەزابوون لە زانستی تجوید:**

پاراستنی زمان لە هەڵەکردن لە قورئانی پیرۆز، زانایانیش هەرلەکۆنەوە هەڵەکردنیان لە قورئاندا بە (لحن) ناو بردووە واتە: لادان لە ڕاستی.

**(لحن) لە قورئاندا دووجۆرە:**

**یەکەم: (لحن)ی ئاشکرا، ئەویش حەوت شێوەی هەیە:**

١- گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی تر.

٢- زەننەدار (ساکن) کردنی پیتی بزواو (متحرك).

٣- جوڵاندنەوەی (تحریك)ی زەننەدار (ساکن).

---

١ پێناسەی (خالد الازهری) بۆ (تجوید) لە: جامع شروح المقدمة الجزرية / ٤٥ .

٢ بۆ ئەم پێناسەیە بڕوانە: النشر في القراءات العشر / ١٦٨ . الجامع في تجويد قراءة القران الكريم/١٥، زۆرێك لە سەرچاوەکانیش هەر هەمان پێناسەیان کردووە .

٤- درێژکردنەوەی پیت کە پیتێکی تری لێوە دروست بێت.

٥- نەهێشتنی مەددی پیتەکان.

٦-سووککردنەوەی پیتی (شدة)دار.

٧-(شدة) دارکردنی پیتی سووك.

دووەم: (لحن)ی نادیار:

ئەم جۆرە هەڵەکردنە پەیوەندی هەیە بەیاساکانی تەجویدەوە وەکو تێهەڵکێشانی ئەوەی تێهەڵکێش ناکرێت، یان ڕاوەستان لەسەر (ت)ی بزواو بە (ه)و هەڵەی لەوجۆرە، بۆنموونە: دەرنەخستنی (همس) لە (ت - ح - ف) یان جیانەکردنەوەی پلەکانی بەرزکردنەوەی پیتی بەرز.

ئەم جۆرەش بۆیە ناونراوە هەڵەی نادیار یان شاراوە، چونکە شارەزایانی قورئان خوێندن نەبێت کەسی تر پێی نازانێ.

(البركوي) لە (احكام تلاوة القران الكريم) لە لاپەڕە (٣٦) دەڵێت:

(هەموو ئەو جۆرە هەڵانە حەرامن، چونکە ئەگەر چی لەسەر واتای ئایەتەکە کاریگەرییان نییە ، بەڵام لەسەر خودی وشەکە کاریگەرییان هەیە و، ڕەونەق و جوانی پیتەکە لەکەدار دەکات)[١].

## حوکمی فێربوونی زانستی تەجوید لەشەرعدا:

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن، کە فێربوونی ئەم زانستە فەرزی کفایەیە، ئەگەر کەسانێك پێی هەڵسن ئەوەکانی تر گوناهبار نابن، بەڵام ئەگەر کەسێ پێی هەڵنەسێت هەموویان گوناهبار دەبن، کارپێکردنیشی واتە جێبەجێکردنی یاساکانی لە

١ بڕوانە: اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / ٤ - ٤١ .

کاتی خوێندنەوەی قورئان (فرض عین)ە. لەسەر هەموو مووسڵمانێکی پێگەیشتوو (بالغ) با لەڕووی یاساو حوکمەکانیشەوە لێیان شارەزانەبێت[١].

## مەسەلەیەکی گرنگ:

دووشێواز هەیە بۆ فێربوونی ئەم زانستە:

١- گوێگرتنی قووتابی بۆ خوێندنەوەی مامۆستا.

٢- خوێندنەوەی قوتابی لەبەردەستی مامۆستا[٢].

زانای پایەبەرز (ملا علی القاري) لە لێکدانەوەکەیدا بۆ هۆنراوەی (الجزریة) ڕێگەی دووەمی پێ باشترە، بەڵام زۆرێك لە زانا هاوچەرخەکان کۆکردنەوەیان پێ باشە لە نێوان هەردوو شێوازەکەدا[٣].

سوود: ئەم زانستە بەهیچ شێوەیەك لە ڕێگەی کتێبەوە بە تەواوەتی لێی شارەزانابێت، بەڵکو پێویستە مامۆستایەك هەبێت بۆ فێربوونی.

واتای گشتی کۆپلەی (٢٧ – ٢٨):

کارکردن بە زانستی تەجوید بۆ قوتابی قورئان پێویستە و جەختی لەسەر کراوە، چونکەهەرکەسێك قورئان بەبێ تەجوید بخوێنێتەوە گوناهبارە، لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی بەم شێوە دایبەزاندووە، سەدە بە سەدە و دەستە بە دەستە ودەست بە دەستیش بە ئێمە گەیشتووە.

❁❁❁

---

١ بڕوانە: المیسر الفرید في علم التجوید / محمد فرید الجمل / ٢٧، احکام التجوید والتلاوة / محمود رأفت الزلط / ٥ .

٢ بڕوانە: الواضح في احکام التجوید / ١١.

٣ بڕوانە: المیسر الفرید / ٥٤.

## جۆرەكانی خوێندنەوەی قورئان

٢٩. وَهُوَ أَيضًا حِلْيَةُ التّلاوَةِ          وَزِيْنَـةُ الأَدَاءِ وَالْقِـرَاءَةِ

(وَهُو) واتە: تەجویدكردنی قورئان.

(حِلْيةُ التّلاوةِ) واتە: جوانی خوێندنەوە.

(وَزِيْنَـةُ الأَدَاءِ وَالقِـرَاءَةِ) واتە: ڕازاندنەوەی بە جێهێنانی قورئان و خوێندنەوەی.

أ- (التّلاوةَ) واتە: خوێندنەوەی قورئان بە دوای یەكدا بەڕێك و پێكی بەپێی ئەو دابەشكردنانەی لە قورئاندا هەیە.

ب- (الأَداءِ) واتە: فێربوونی قورئان لە مامۆستایانەوە.

ت- (القِـراءَةِ) بە هەردوو حاڵەتی پێشوو دەوترێت و لەوان گشتگیرترە[1].

٥٥٥

---

١ بڕوانە: الدرر البهية / ٤٠ .

# پایەكانی قورئان خوێندن

**زانایان دەفەرموون:** (خوێندنەوەی قورئان سێ پایەی هەیە):

**أ- (التحقیق)**[١] **واتە:** خوێندنەوەی قورئان بە هێمنی و لەسەر خۆیی، لە گەڵ تێگەیشتنی واتاكان و چاودێریكردنی یاساكانی تەجوید، ئەم شێوە خوێندنەوە گونجاوە بۆ كەسانی سەرەتایی كە دەیانەوێت فێری قورئان خوێندنەوە بن، بۆ ئەوەی ڕابێن لەسەری.

**ب- (الحدر) واتە:** پەلە كردن لە خوێندنەوەی قورئان هاوكات پارێزگاری كردن لە بنچینەكانی تەجوید و ڕەچاوكردنیان.

**ت- (التدویر)** خوێندنەوەی قورئان بەشێوەیەكی مام ناوەند لە نێوان حاڵەتی یەكەم و دووەمدا، هاوكات لەگەڵ جێبەجێكردنی یاساكانی تەجوید[٢].

**واتای گشتی:**

**هەروەها تەجوید جوانی و ڕازاندنەوەیە بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.**

٣٠. وَهُوَ إِعْطَاءُ الْحُرُوفِ حَقَّهَا ‌‌ ‌‌ ‌‌ مِنْ صِفَةٍ لَهَا وَمُستَحَقَّهَا

**(وَهُوَ) واتە:** تەجوید.

**(حَقَّهَا) واتە:** لەو سیفەتە هۆگرانەی لەگەڵ پیتەكاندایە وەكو: (همس) و (جهر) و (شدة) و (رخاوة) لەو سیفەتانەی كە باسمان كرد.

---

١ هەندێك لە زانایان لە جیاتی (التحقیق) (الترتیل) بەكاردەهێنن .

٢ بڕوانە: الواضح في احكام التجوید / د.محمد عصام القضاة /١٠ .

(مُسْتَحَقَّهَا) ئەوەی کە لە ئەنجامی بەجێهێنانی سیفەتەکانەوە دروست دەبن، وەکو: ناسککردنەوەی پیتی نزم و، قەڵەو کردنی پیتی بەرز و شتی لەو شێوەیە.

**واتای گشتی:**

هەروەها تەجوید بریتیە لەوەی مافی پیتەکان بدرێت وەکو سیفەتە هۆگرەکانیان و، ئەوەش کە دروست دەبێت لە جێبەجێکردنی سیفەتەکانەوە، وەکو بچوك کردن و گەورە کردنەوەی پیتەکان.

٣١. وَرَدُّ كُـلِّ وَاحِـدٍ لأَصْلِـهِ وَاللَّفْظُ فِـي نَظِيْرِهِ كَمِثْلِهِ

(رَدُّ) واتە: گێڕانەوەی هەموو پیتێك بۆ جێگەی دەرچونی سەرەکی خۆی.

(وَاللَّفْظُ فِـي نَظِيْرِهِ) واتە: دەربڕینی پیتێکی هاوشێوەی ئەو پیتە لە شوێنێکی تر، ئەگەر دووبارە بووەوە.

(كَمِثْلِهِ) هەر وەکو دەربڕینێتی یەکەم جار.

**واتای گشتی:**

هەروەها تەجوید واتای ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو پیتێك بگێردرێتەوە بۆ مەخرەجی سەرەکی خۆی، ئەگەر پیتێکی تریش هەبو لە جێگەیەکی تر وەکو ئەو پیتە ئەویش بە بێ زیاد و کەم هەمان شێوازی لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

٣٢. مُكَمّلاً مِنْ غَيْرِ مَـا تَكَلُّفِ بِاللُّطْفِ فِي النُّطْقِ بِـلا تَعَسُّفِ

(مُكَمّلاً) واتە: لە حاڵەتێکدا کە ویستت بە تەواوی قورئان بخوێنیتەوە.

(مِنْ غَيْرِ مَـا تَكَلُّفِ) واتە: بەبێ زۆر لە خۆکردن لە کاتی خوێندندا.

(بِاللُّطْفِ) واتە: دەربڕینی پیتەکان بە هێمنی و ئاسانی و، بە بێ سنور بەزاندن و بێ زێدەڕەوی و کەمتەرخەمی.

(مَــا) بۆ زیاتر جەخت کردنەوەیە.

**واتای گشتی:**

لەکاتی دەربڕینی پیت و وشەکانی قورئانی پیرۆزدا، پێویستە بە تەواوی بەبێ زیادەڕەوی ئەو سیفەتانەی باسمانکرد جێ بەجێ بکرێت.

چەند نمونەیەك لە زێدەڕەوی لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا

(إبن الجزري) لە کتێبی (النشر في القراءات العشر)لە لاپەڕە ١٦٩ دەفەرموێت:

(وليس التجويد بتمطيغ اللسان ولا بتقعير الفم ولا بتعويج الفك و لا بترعيد الصوت ولا بتمطيط الشد ولا بتقطيع المد ولا بتطنين الغنات ولا بحصرمة الراءات).

**تەجوید بریتی نیە لە:**

(تمظيغ اللسان) **واتە:** قورئان دەخوێنێ و دەڵێی پارووێکی لە دەمدایە.

(تقعير الفم) **واتە:** فشار خستنە سەر گەروو لەکاتی خوێندنەوەدا، **واتە:** هەموو پیتەکان وەکو پیتی (ع) دەردەکات (تعويج الفك) **واتە:** لارکردنەوەی پیتەکان یان لارکردنەوەی شەویلگەی لەکاتی خوێندندا.

(ترعيد الصوت) لەراندنەوەی دەنگ و، واپیشاندات کە خوێنەر لە ترسی خوا دەگرێت و دەنگی دەلەرزێ واتە وا دەردەکەوێت حاڵەتێکی دروست کراوە[1].

(تمطيط الشد) **واتە:** درێژکردنەوەی ئەو پیتانەی (شدة)دارن و درێژ کردنەوەیان تێدا نیە **بۆنمونە:** (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

(تقطيع المد) **واتە:** بڕبڕکردنی پیتی مەدد، **وەکو:** (يــاااأيها الذين امنووو).

---

[1] زۆر گریان لەکاتی قورئان خوێندندا، بەتایبەتی ئەگەر خوێنەرەکە بەزۆر خۆی بگرێنێ، دوو مەترسی لێ چاوەڕوان دەکرێت: یەکەم مافنەدانی پیتەکان و شێواندنی ئایەتەکان ، دووەمیش خوێنەرەکە بەزمانی حاڵ دەڵێت: من زۆر لە خوا دەترسم ودەگریم لە قورئان خوێندندا، مەگەر گریانێك بەدەستی خۆت نەبێت، بۆیە ئەگەر چی هەندێ بەڵگە و شوێنەوار هاتوون دەربارەی گریان لە قورئاندا، بەڵام لەم ڕۆژگارەی خۆماندا بەدوور نیە لە مەترسی ڕوپامایی (والله أعلم).

(تطنين الغنات) واتە: بڕبڕکردنی (غنة) مینگە لە پیتەکانی (غنة) دا وەکو: (من الجننة والنناس).

(بحصرمة الراءات) واتە: ڕاگرتنی هەناسە بە تەواوی لەکاتی دەربڕینی پیتی (ر) و ڕێگەنەدان بە دەرکردنی سیفەتی (بینیة) تێیدا.

هەموو ئەم نمونانەش مامۆستا (أیمن سوید) لە یەکێك لە وانەکانی لە کەناڵی (اقرأ)ی ئاسمانی باسی کردووە و، هەڵەکانی بەرجەستە کردووە بە نمونە بۆ ئەوەی خوێنەران خۆیانی لێ بە دوور بگرن.

✿✿✿

(تطنين الغنات) واتە: بڕبڕکردنی (غنة) مینگە لە پیتەکانی (غنة) دا وەکو: (من الجننننة والنننناس).

(بحصرمة الراءات) واتە: ڕاگرتنی هەناسە بە تەواوی لەکاتی دەربڕینی پیتی (ر) و ڕێگەنەدان بە دەرکردنی سیفەتی (بینیة) تێیدا.

هەموو ئەم نمونانەش مامۆستا (أیمن سوید) لە یەکێك لە وانەکانی لە کەناڵی (اقرأ)ی ئاسمانی باسی کردووە و، هەڵەکانی بەرجەستە کردووە بە نمونە بۆ ئەوەی خوێنەران خۆیانی لێ بە دوور بگرن.

٭٭٭

# ڕێگەی فێربوونی تەجوید

٣٣. وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ تَرْكِهِ      إِلاَّ رِيَاضَةُ امْـرِئٍ بِفَكِّـهِ

(بَيْنَهُ) لە نێوان تەجوید و

(تَرْكِهِ) لە نێوان لێدوورکەوتنەوەی

(رِيَاضَةُ) بەردەوامبوونی

(امْـرِئٍ) کەسێکە لە ڕاهێنان

(بِفَكِّهِ) بە شەویلکەی واتە: دەمی.

(طاش كبري زادة) فەرموویەتی: دانەر ڕەحمەتی خوای لێبێت وەکو ئەوەی هەستی کردبێت ئەم هەموو بابەتانە قورس بێت لەسەر فێرخوازان و تووشی سەرسام بوونیان بهێنێت بۆیە فەرموویەتی: جیاوازی نێوان شارەزاو نەشارەزا لە تەجوید هەرئەوەیە ڕاهێنان بە دەمی بکات و گوێ لە مامۆستایانی قورئان بگرێت، تاکو لێهاتوویی بەدەست بهێنێت[1].

واتای گشتی:

(إبن الجزري) لێرەدا ئامۆژگاریمان دەکات بەردەوام بین لەسەر خۆ ڕاهێنان لەسەر چاك خوێندن و جوان خوێندنەوەی قورئان، چونکە ئەگەر بۆ ماوەیەك فەرامۆش

---

١ بڕوانە: شرح المقدمة الجزرية / طاش كبري زادة / ١١٩، بەوەرگرتن لە کتێبی الشرح الوجيز / ٦٠.

بکرێت بە جێهێنانی یاساکان بیر دەچنەوە، واتای کۆپلەکەش بە کورتی: (لە نێوان تەجوید و نەمانی هەر ئەوەیە کەسێك بەردەوام بێت لەسەر خۆ ڕاهێنان لەسەر قورئان خوێندنەوە بەشێوەیەکی جوان)[١].

✿✿✿

١ بڕوانە: اللمعة البدرية / ٤٢، الدرر البهية / ٤٢ .

## بابەتی بچووککردنەوە

**بچووککردنەوەی پیتە نزمەکان**

**لەم بەشەی هۆنراوەکەیدا (إبن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێبێت باسی هەندێ بنەما و یاسای پەیوەندی دارمان بۆ دەکات بە تەجویدەوە، کە لە سیفەتەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و دەفەرموێت:**

٣٤. فَرَقِّقَنْ مُسْتَفِلاً مِنْ أَحْـرُفِ     وَحَـاذِرَنْ تَفْخِيمَ لَفْظِ الأَلِـفِ

(فَرَقِّقَنْ مُسْتَفِلاً مِنْ أَحْـرُفِ) **واتە: پیتە نزمەکان بچووککەرەوە.**

(وَحَـاذِرَنْ تَفْخِيمَ لَفْظِ الأَلِـفِ) **واتە: وریاش بە لەوەی پیتی ئەلیف (ا) گەورە بکەیتەوە.**

**پێناسەی** (الترقیق)**:**

**لە زمانەوانیدا: لە (الرقة)ەوە هاتوە، واتە: لاوازی.**

**لە زاراوەدا واتە: بچووککردنەوەی پیت بە بچووککردنەوەی لە مەخرەج و لاوازکردنی لە سیفەتدا.**

**پێناسەی** (التفخیم)**:**

**لە زمانەوانیدا واتە: گەورە کردن.**

**لە زاراوەدا واتە: گەورە کردنی پیت بە قەڵەوکردنی لە مەخرەج و، بە هێز کردنی لە سیفەتدا.**

لەم کۆپلەیەدا (إبن الجزري) باسی هەندێ یاسای گرنگمان بۆ دەکات سەبارەت بە ڕاستکردنەوەی قورئان خوێندن. پێویستە لەسەر خوێنەر ڕەچاویان بکات، بۆنمونە: پیتە نزمەکان واتە پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتە بەرزەکان هەموو بە بچوکی دەخوێنرێتەوە مەگەر لە حاڵەتێکدا ڕیوایەت هەبێت وەکو گەورە کردنەوەی لام لە هەندێ حاڵەتدا. هەروەها هۆشیارمان دەکاتەوە لە گەورە کردنەوەی پیتی ئەلیف (ا)، چونکە لە ڕاستیدا ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە و، لەم ڕۆژگارەدا زۆر بڵاو بوەتەوە و، لە بنچینەشدا لە عەجەمەکانەوە ئەم عادەتە پەیدا بوە)[١].

٣٥. كَهَمْزِ أَلْحَمْدُ أَعُوذُ إِهْدِنَا  أَللَّهُ ثُمَّ لَامِ لِلَّهِ لَنَا

زانای پایە بەرز (خالد الازهري) دەڵێت:

لێرەدا (إبن الجزري) هۆشیاری دەدات کە پیتی (ء) هەمزە لە چوار جێگەدا بچوك دەکرێتەوە.

یەکەم: کاتێك بە تەنیشتی پیتی (ح)ەوە بێت، وەکو: (الحمد لله رب العالمین) ئەگەر کەسێك بڵێت: لێرەدا هەمزەکە بە تەنیشتی لامەوەیە نەك (ح) دەڵێم: قسەکەت تەواوە بەلام لەبەر ئەوەی پیتی (ل) زەننەدارە وەکو ئەوەیە بوونی نەبێت.

دووەم: لە لای پیتی (ع)، وەکو: (اعوذ بالله).

سێ یەم: لە لای پیتی (ه)، وەکو: (أهدنا الصراط).

چوارەم: لەلای پیتی لامی ناساندنی گەورە. وەکو: (الله الذي) لە پاش ئەوەش فەرمانی کردووە بە بچوککردنەوەی پیتی لام لە وشەی مەزنی (لله) و، جەختیش دەکاتەوە لەسەر دەرخستنی پیتی (ل) لە وشەی (لنا) بە هۆی نونەکەی دوای خۆی[٢].

---

١ بڕوانە: جامع شروح المقدمة الجزرية في علم التجويد/ خالد الازهري و زكريا الانصاري .

٢ بڕوانە: اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / ٤٣ .

٣٦. وَلْيَتَلَطَّفْ وَعَلَى اللَّهِ وَلاَ الضْ       وَالْمِيمِ مِنْ مَخْمَصَةٍ وَمِنْ مَرَضْ

**واتە: پێویستە خوێنەر وریا بێت و پیتی (ل) واتە: لامی دووەم لە وشەی (وَلْيَتَلَطَّفْ) بچوککاتەوە، چونکە بە تەنیشت پیتی (ط)ە، کە پیتێکی بە هێزە و کاریگەری هەیە لەسەر پیتی (ل)ی تەنیشتی.**

**هەروەها پێویستە لامی یەکەم لە وشەی (وعلى الله) و (ولا الضّالّين) بچوك بکرێتەوە، چونکە ئەو پیتە گەورانەی پاش خۆیان کاریگەرییان هەیە لەسەر یان.**

**هەروەها جەخت دەکاتەوە لەسەر بچوککردنەوەی پیتی (م) لە وشەی (مَخْمَصَةٍ)، چونکە زۆربەی خوێنەران لەو پیتەدا هەڵە دەکەن بە هۆی گەورەیی پیتی (خ) ئەوەش هەڵەیەکی نادروستە)[١]، بەهەمان شێوە پێویستە خوێنەر وریابێت نەوەکو پیتی (م) گەورە بکاتەوە لە وشەی (مرض) بەهۆی پیتی (ر)ەوە کە قەڵەوە.**

٣٧. وَبَاءِ بَرْقٍ بَاطِلٍ بِهِمْ بِذِي       وَاحْرِصْ عَلَى الشِّدَّةِ وَالْجَهْرِ الَّذِي

٣٨. فِيهَا وَفِي الْجِيمِ كَحُبِّ الصَّبْرِ       وَرَبْوَةٍ اجْتُثَّتْ وَحَجِّ الْفَجْرِ

**هەروەها ئامۆژگاریمان دەکات بچوکی پیتی (ب) بپارێزین لەم نمونانەدا.**

**(بَرْقٍ) بەهۆی دراوسێتی (ر) کە پیتێکی گەورەیە.**

**(بَاطِلٍ) بەهۆی نزیکی لە پیتی (ط).**

---

**١ بڕوانە: شرح طيبة النشر / ١٤٧ بە وەرگرتن لە اللمعة البدرية / ٤٤.**

(بِهِمْ بِذِي) بەهۆی ئەوەی بە تەنیشتی دوو پیتی نەرمەوەیە، ئەوەش نەبێت بچووککردنەوەی پیتی (ب) تایبەت بێت بەم شوێنانەوە، بەلاَم نابێت زێدەڕەوی بکرێت لە بچووککردنەوەی پیتی (ب) نەوەکو وەکو (إمالة)ی پێبێت[١].

(وَاحْرِصْ عَلَى الشِّدَّةِ وَالجَهْرِ الَّذِي) واتە: هەروەها وریای دەرخستنی ئەو دوو سیفەتەش بە لە پیتی (ب).

(وَفِي الْجِيمِ) واتە: هەروەها پێویستە ئەو دوو سیفەتە لە پیتی (ج) یشدا دەربخرێت بە جوانی، ئەگینا مەترسی تێکەڵ بوون هەیە لە نێوان (ب) لەگەڵ (ف) هەروەها (ج) لەگەڵ (ش)دا.

ئینجا چەند نمونەیەکی ئاشکرای لە قورئاندا بۆ هێناوینەتەوە وەکو وشەی (حب) لە ئایەتی: {يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ}البقرة١٦٥.

(بِالصَّبْرِ) لە ئایەتی {وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ}العصر٣.

(رَبْوَةٍ) لە ئایەتی {وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ}المؤمنون٥٠.

(اجْتُثَّتْ) لە ئایەتی {اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ}إبراهيم٢٦.

(بِالْحَجِّ) لە ئایەتی {وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ}الحج٢٧.

(الْفَجْرِ) لە ئایەتی {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ}الإسراء٧٨.

---

١ بڕوانە: شرح طيبة النشر / ١٤٧، بەوەرگرتن لە اللمعة البدرية / ٤٤.
– الدرر البهية شرح المقدمة الجزرية / ٤٤.

بۆ نموونە: ئەگەر ئەو دوو سیفەتەی (ابن الجزري) وریامان دەکاتەوە کە پێویستە دەریخەین لە پیتی (ج) جێبەجێی نەکەین تێیدا وشەی (اجتث) دەبێتە (اشتث).

٣٩. وَبَيِّنَنْ مُقَلْقَلاً إِنْ سَكَنَا    وَإِنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ كَانَ أَبْيَنَا

٤٠. وَحَاءَ حَصْحَصَ أَحَطتُّ الْحَقُّ    وَسِينَ مُسْتَقِيمِ يَسْطُو يَسْقُو

(ابن الجزري) لەم بەشەدا فەرمانمان پێ دەکات سیفەتی قەلقەلە بە ڕوونی دەریخەین لە پیتەکانی (قلقلة)، (ق ط ب ج د) لە کاتی (ساکن) بوونی پیتەکە.

(وَإِنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ) واتە: ئەگەر لەکاتی ڕاوەستان بێت لەسەر پیتەکە، وەکو: (قريبْ).

(كَانَ أَبْيَنَا) واتە: پیتی (قلقلة) بە ڕوونتر دەجوڵێتەوە لە ڕاوەستاندا.

چەند نموونەیەك لەسەر (قلقلة):

- لە کاتی بەردەوام بوون: (يَقْطعون – وقطر – واجتَبيناه – ويدخلون).

- لە کاتی ڕاوەستان دا (خلاق – محيط – بهيج – مجيد).

- جگە لەمانەش کە باسکران، پێویستە ئاگاداری بچووککردنەوەی (ح) ی یەکەم و دووەم بین لە وشەی (حصحص الحقّ) چونکە بە تەنیشت پیتێکی گەورەوەیە وەکو (ص)، هەروەها لە وشەی (احطت) و (الحقّ)یشدا بەهۆی دراوسێتی بۆ هەردوو پیتی گەورەی (ط) و(ق) وەکو: (الحقّ من ربك).

بە هەمان شێوە ئاشکراکردن وجوان دەربڕین پێویستە سەبارەت بە بچوککردنەوەی پیتی (س) لە وشەی (مستَقِیم) (یسطو) لە ئایەتی (یکادون یسطون) و، لە وشەی (یسقو) لە ئایەتی (وجدعلیه امة من الناس یسقون)[١].

سوود: ئاگادارکردنەوە دەربارەی بچوك دەربڕینی پیتی (س) کورت هەڵنەهاتووە لەسەر ئەم حاڵەتانە، بەڵکو بابەتێکی گشتی یە لە هەموو حاڵەتێکدا، لە زەننەداری و بزواوی، بە تەنیشت پیتێکی گەورە بێت یان بچووك[٢].

واتای گشتی هەردوو کۆپلەکە:

پیتی جوڵاو (مقلقل) بە جوانی دەربڕە لە کاتی (ساکن)یدا، لەکاتی وەستانیشدا، بۆ نمونە وەکو ڕاوەستان لەسەر وشەی (قریب) ڕونتر دەردەکەوێت.

هەروەها پێویستە هەردوو پیتی (ح – س) بە بچوکی بخوێنرێتەوە، بەتایبەتی کاتێك بە تەنیشتی پیتی گەورەوە بن وەکو: (ص – ق).

۞۞۞

١ بڕوانە: جامع شروح المقدمة الجزرية / ٥٦ .

٢ بڕوانە: الدرر البهية / ٤٤ .

## بابەتی پیتی (ر)

٤١. وَرَقِّقِ الرَّاءَ إِذَا مَا كُسِرَتْ         كَذَاكَ بَعْدَ الْكَسْرِ حَيْثُ سَكَنَتْ

٤٢. إِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلِ حَرْفِ اسْتِعْلاَ         أَوْ كَانَتِ الكَسْرَةُ لَيْسَتْ أَصْلاَ

(وَرَقِّقِ الرَّاءَ إِذَا مَا كُسِرَتْ) واتە: هەركاتێك پیتی (ر) ژێر (كسرة) ی هەبوو بە بچووكی بیخوێنەوە، وەكو: (رِزقا – الرِح – ارني).

(كَذَاكَ بَعْدَ الْكَسْرِ حَيْثُ سَكَنَتْ) بە هەمان شێوە بە بچووكی (ترقيق) دەخوێنرێتەوە ئەگەر خۆی (ساكن) بوو، پێش خۆیشی ژێر (كسرة)ی بنچینەیی (اصلي) بێت، وەكو: (الفِرْدوس).

(إِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلِ حَرْفِ اسْتِعْلاَ) واتە: ئەگەر پیتی (ر) كەوتە پێش یەكێك لە پیتە بەرزەكانەوە، وەكو: (قرطاس – فرقة – لبالمرصاد) لەو حاڵەتەدا گەورە دەكرێتەوە بە هۆی ئەو پیتە گەورانەوە[1].

سوود: لە قورئاندا تەنها سێ پیت لە پیتەكانی (استعلاء) لە پاش پیتی (ر)ەوە هاتوون، كە بریتین لە (ص – ط – ق)[2].

---

١ بڕوانە: اللمعة البدرية / ٤٥ .

٢ بڕوانە: لێكدانەوەی (زكريا الانصاري) بۆ (الجزرية) لە جامع الشروح/٥٩.

(أَوْ كَانَتِ الكَسْرَةُ لَيْسَتْ أَصْلاً) واتە: ئەگەر لە حاڵەتێکدا (کسرة) ی پیتی (ر) ئەصلی نەبوو، وەکو: (ام ارتابوا – ارتبتم) گەورە دەکرێتەوە.

**ڕوونکردنەوە:** ئەگەر پیتی (ر) ساکن بوو، بەهۆی ڕاوەستانەوە–ئیتر بەهەر شێوەیەك بزواوبێت لە حاڵەتی بەردەوامیدا–خۆی لە یەکێك لەم حاڵەتانەی خوارەوە دەبینێتەوە.

**یەکەم:** پیتی پێشی خۆی سەر (فتحة)ی هەبێت، وەکو: (ترمی بشَرَر – ولمن صَبَرْ) گەورە دەکرێتەوە.

**دووەم:** پیتی پێش خۆی بۆر (ضمة) ی هەبێت، وەکو: (بالنذُرْ – الدُّبُرْ – النذُرْ) گەورە دەکرێتەوە.

**سێیەم:** پیتی پێش خۆی ژێر (کسرة)ی هەبێت، وەکو: (یوم عسر) بچوك دەکرێتەوە.

**چوارەم:** پێش خۆی ئەلفێکی مەددی هەبێت، وەکو: (ان الفجارْ – بئس القرار – وقناعذاب النارْ) گەورە دەکرێتەوە.

**پێنجەم:** پێش خۆی واوێکی مەددی هەبێت، واتە: واوی زەننەدار (ساکن) کەپیتی پێش خۆی بۆر (ضمة)ی هەبێت، وەکو: (لن تبور – ترجع الامور – من في القبور) گەورە دەکرێتەوە.

**شەشەم:** پێش خۆی یائێکی مەددی هەبێت واتە: یائی زەننەدار (ساکن) کە پیتی پێش خۆی ژێر (کسرة)ی هەبێت، وەکو: (خبیر – یوم عسیر – والحمیر) بچووکدەکرێتەوە.

حەوتەم: پێش خۆی (ي)ێكی زەننەدار (ساكن) هەبێت، وەكو؛ (من خير – لا ضير – فالله خير) بچوك دەكرێتەوە.

هەشتەم: پێش خۆی پیتێكی زەننەدار (ساكن)ی راستی (صحيح) هاتبێت، پێش ئەو پیتە زەننەدارەش پیتێك بێت سەر یان بۆری هەبێت، وەكو؛ (يردُ الله بكم اليسر – والفجر – سندس خضر) گەورە دەكرێتەوە.

نۆیەم: پێش خۆی پیتێكی نزم (مستفل) بێت و، پێش ئەوەش پیتێكی (مكسور) هەبێت، وەكو: (من ذكر – وما علمناه الشعر – ولابكر) بچوك دەكرێتەوە.

دەیەم: لە پێش خۆی پیتێكی بەرز (استعلاء) هاتبێت، پێشی ئەو پیتە بەرزەش پیتێكی ژێردار (مكسور) بێت، لەم جۆرەش لە قورئاندا دوو وشە هاتووە (مصر – القطر) ئەم دوو وشە هەردوو حاڵەتی گەورەكردن و بچوككردن هەڵدەگرن.

سوود: وشەی (مصر) لە چوار جێگەدا لە قورئاندا هاتووە.

یەكەم {أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتاً وَاجْعَلُواْ} يونس٨٧.

دووەم: {وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ} يوسف٢١ .

سێیەم: {وَقَالَ ادْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَاء اللّهُ آمِنِينَ} يوسف٩٩.

چوارەم: {قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ} الزخرف٥١ .

سەبارەت بە وشەی (القطر) تەنها یەكجار لە قورئاندا هاتووە؛

{وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ} سبأ١٢.

تێبینی: (إبن الجزري) گەورەکردنەوەی پەسەندکردووە لە وشەی (مصر) و بچووککردنەوە لە وشەی (القطر) وەکو دانەری کتێبی (أحکام تلاوة القرآن) مامۆستا (محمود خليل الحصري) دەیگێڕێتەوە[١].

هەروەها زانای پایەبەرز ناسراو بە (الشيخ المتولي) لە کتێبی (غنية المقري) لەلاپەرە ٤٨ دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| والراجح التفخيم في البشر | والفجر ايضاً وكذا بالنذر |
| وفي اذا يسر اختيارالجزري | ترقيقه وكذا ونذر |
| ومصر فيه اختار ان يفخما | و عكسه في القطر عنه فاعلما |
| وذلك كله بحال وقفنا | والروم كالوصل على مابينا |

پاژەیەم: لە پاش پیتی (ر) یائێکی لابراو هەبێت بۆ سووککردنەوە. لەو حاڵەتەشدا هەردوو شێوازی خوێندنەوە هەڵدەگرێت: گەورەکردنەوە و بچووککردنەوە، ئەمەش لە (٣) وشە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

یەکەم: وشەی (نذر) لە ئایەتی (عذابي ونذر) لە شەش جێگە.

دووەم: وشەی (يسر) لە ئایەتی (والليل اذا يسر).

سێیەم: وشەی (الجوار) لە سێ ئایەتدا هاتووە:

---

[١] چونکە لەکاتی خوێندنەوە و پێکشتن (وصل) راثی مصر (فتحه)ی لەسەرە، تەنها بە قەڵەوی دەخوێنرێتەوە، بۆیە لەکاتی وەستان لەسەری بە ئیعتیباری ئەصل فەتحەکە ئەرجەح وایە بە قەڵەوی بخوێنرێتەوە، بەڵام (القطر) (مضاف إليه و مكسور)ە لەکاتی خوێندن و (وصل)دا تەنها بە سووککردنەوە دەخوێنرێتەوە، جا لەکاتی راوەستان بچووککردنەوە پەسەندە. ((م.دلێر گەرمیانی))

{وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ} الشورى٣٢.

{وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ} الرحمن٢٤.

{الْجَوَارِ الْكُنَّسِ} التكوير١٦.

**سوود: بنەمایەكی ئاسان هەیە زۆربەی حاڵەتەكانی پیتی (ر) دەگرێتەوە.**

**هەركاتێك پیتی (ر) سەرو بۆری هەبوو گەورەدەكرێتەوە، ئەگەر ژێری بوو بچووك دەكرێتەوە، لەهەر شوێنێكی وشەدا بێت ئەگەر زەننەداربوو (ساكن)، تەماشای پیتی پێش خۆی دەكەین، ئەگەر ئەو پیتە سەروبۆری هەبوو گەورەی دەكەینەوە ئەگەر ئەو پیتە ژێری بوو بچوكی دەكەینەوە.**

**ئەگەر پیتی (ر) (ساكن) بوو، پیتی پێشی خۆیشی هەر ساكن بوو، تەماشای پیتی پێشتر دەكەین و هەمان یاساكانی بەسەردا جێ بەجێ دەكەین، تەنها ئەگەر لە حاڵەتێكدا پیتی پێش (رْ)ی (ساكن) (ي) مەددی یان (لین) بێت ئەوە بچوك دەكرێتەوە وەكو: (خيرْ – طيرْ)[1].**

۞۞۞

---

**١ مامۆستا (احمد عامر) ئەم بنەمایەی باس كرد لە كەناڵی (الليبية)ی ئاسمانی.**

## بابەتی گەورەکردنەوە

**پیتی (ل):**

٤٤. وَفَخِّمِ اللاَّمَ مِنِ اسْمِ اللَّهِ     عَنْ فَتْحٍ أَوْ ضَمٍّ كَعَبْدُ اللَّهِ

**واتە:** وشەی مەزنی (اللهِ) بە گەورە بخوێنەوە ئەگەر پیتی پێش خۆی (فتحة) یان بۆر (ضمة)ی هەبوو، وەکو: (وقال الله انی معکم) (وانه لما قام عبدالله)[1].

**حاڵەتەکانی وشەی مەزنی (الله) لە تەجویدا:**

١- خوێندنەوەی بە گەورەیی (تفخیم).

٢- خوێندنەوەی بە شێوازی (ترقیق).

**حاڵەتەکانی گەورە کردنەوەی:**

* ئەگەر پێش وشەی (الله) (فتحة) بێت، وەکو: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} الإخلاص١.

یان وشەکە خۆی بەسەر (فتحة) دەستی پێ کردبێت، وەکو: {الله الصمد} الإخلاص٢.

پێویستە وریاش بیت هەمزەکەی گەورە نەکەیتەوە.

* ئەگەر پێش وشەی (الله) بۆر (ضمة) هاتبێت، وەکو: {نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ} الهمزة٦.

---

[1] لێکدانەوەی زانایان (خالد الازهري) و (زکریا الانصاري) بۆ ئەم کۆپلەیە لە جامع الشروح/٦١.

* ئەگەر پێش وشەی (الله) پیتێکی زەننەدار (ساکن) بێت وپێش ئەو (ساکن)ەش (فتحة) بێت، وەکو: {وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطاً} الجن٤ .

● ئەگەر پێش وشەی (الله) پیتێکی زەننەدار (ساکن) بێت و، پێش ئەو (ساکن)ەیش (ضمة)ی هەبێت، وەکو: {أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ} نوح٣.

**حاڵەتەکانی بە (ترقیق) خوێندنەوەی وشەی مەزنی (الله):**

● ئەگەر (کسرة)ەیەکی ئەصڵی لە پێشەوە بێت، وەکو:

{وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ} الأنفال١٠.

● ئەگەر پێش وشەکە (کسرة)ەیەکی (عارض) هەبێت، وەکو:

{لِمَ تَعِظُونَ قَوْماً اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ} الأعراف١٦٤، بە (قومَنِ اللّه) دەخوێنرێتەوە.

● ئەگەر پێشەوەی خۆی (ساکن) بێت و، پێش ئەو (ساکن)ەیش (کسرە) بێت، وەکو: {وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوا بِمَفَازَتِهِمْ} الزمر٦١ .

## گەورەكردنەوەی پیتەكانی (استعلاء و إطباق)

٤٥ . وَحَرْفَ الاسْتِعْلاءِ فَخِّمْ وَاخْصُصَا لاطْبَاقَ أَقْوَى نَحْوَ قَالَ وَالْعَصَا

**(إبن الجزري) لێرەدا داوامان لێ دەكات پیتەكانی (استعلاء) بەرزكەینەوە كە بە پێی پلەی بە هێزییان بەم شێوەن: (ط – ض– ص – ظ – ق – غ – خ) بەتایبەتیش لە نێوانیان دا پیتەكانی (اطباق) كە بریتین لە (ص – ض – ط – ظ) چونكە ئەم چوارە بەرزترین پیتەكانی (استعلاء)ن.**

### زانیاریەكی گرنگ:

**هەموو پیتێك لە پیتەكانی (استعلاء) پێنج پایەی هەیە لە بەرزی دا بەم شێوەی لای خوارەوە:**

**١- پیتی (استعلاء) سەر (فتحة)ی هەبێت و، پیتی ئەلیفی (ا)ی بەدوادا هاتبێت، وەكو:** (الطامة – يضاعف – ظالمين – قائلون – غافلين – خائنين).

**٢- پیتی (استعلاء) سەر (فتحة)ی هەبێت و، ئەلیفی بەدوادا نەیەت، وەكو:** (طلبا – ضربتم – صبر – ظلم – غضب – خلق).

**٣- پیتی (استعلاء) بۆر (ضمة)ی هەبێت، وەكو:** (وطُبع – فضُرب– صُرفت – ظُلم – قُتل – غُلبت – خُلقوا).

**٤- پیتی (استعلا ) زەنندەدار (ساكن) بێت، وەكو:**
(يطْبع – يضْرب – فاصْبر – لايظْلم – يقْرؤون – يغْلب – يخْلق).

**٥ – پیتی (استعلاء) ژێر (كسرة)ی هەبێت، وەكو:**

(طِرت – ضِعافاً – صِراط – ظِلال – قِتال – غِطائك – خلال).

کەواتە هەر پیتێکی بەرز پێنج پایەی هەیە، لە هەموویان بەرزتر پیتی (ط)ە کە ئەلیفی (ا) بەدوادا بێت، پیتی (خ)یش کە ژێر (کسرة)ی هەبێت لە کۆتایی هەموویان دێت لە ڕوی بەهێزییەوە)[١].

واتای گشتی:

پێویستە پیتەکانی (استعلا ) واتە: پیتە بەرزەکانی (خص ضغط قظ) بە گەورەیی دەرببڕدرێت، بەتایبەتی پیتەکانی (اطباق) لەنێوانیان دا کە بریتین لە (ض – ص– ط – ظ).

٤٦ . وَبَيِّنِ الإِطْبَاقَ مِنْ أَحَطتُّ مَعْ بَسَطتَّ وَالْخُلْفُ بِنَخْلُقْكُمْ وَقَعْ

(وَبَيِّنِ الإِطْبَاقَ) واتە: لە پیتی (ط) لە فەرموددەی خوای گەورە: (فقال احطت) هەروەها ئایەتی (لئن بسطت) و، ئەو جۆرە ئایەتانە بۆ ئەوەی پیتی (ط) لەگەڵ پیتی (ت) تێکەڵ نەبن چونکە مەخرەجیان واتە جێگەی دەرچونیان یەك جێگەیە.

(وَالْخُلْفُ) واتە: لە نێوان زانایان دا جیاوازی هەیە دەربارەی هێشتنەوەو نەهێشتنەوەی سیفەتی بەرزی پیتی (ق) لەگەڵ تێهەڵکێشکردنی لە وشەی (نَخْلُقْكُمْ) لە ئایەتی (الم نخلقكم)، نەهێشتنیشی بەلای (إبن الجزري) ەوە پەسەندە وەکو خۆی بڕیاری داوە لە کتێبی (التمهيد)دا.

۞۞۞

---

١ یەکێك لە زنجیرە وانەکانی مامۆستا (ایمن سوید) لە تەجوید، باسی ئەم مەسەلە دەکات لە کەناڵی (اقرأ).

## هەندێ ئاگاداری
## لە مەڕ بەکارهێنانی سیفەتی پیتەکان

٤٧ . وَاحْرِصْ عَلَى السُّكُونِ فِي جَعَلْنَا أَنْعَمْتَ وَالمَغْضُوبِ مَعْ ضَلَلْنَا

**واتە:** ئەی خوێنەری قورئانی پیرۆز، ئامۆژگارییەکت دەکەم وریای دەرخستنی (سکون) بیت لە پیتی (ل) لە وشەی (جَعَلْنَا)، هەروەها ئاگاداری (سُکُون)ی هەردوو پیتی (نْ) لە (أَنْعَمْتَ) و (غ) لە (المَغْضُوبِ) و، لامی دووەم لە (ضَلَلْنَا) بەجوانی دەریان برە، بێگومان تێبینیش کراوە کە خەڵکانێکی زۆر ئەم پیتانە دەجوڵێننەوە لە خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) ئەوەش هەڵەیەکی ئاشکرایەو لەحنێکی قەدەغەکراوە.

٤٨ . وَخَلِّصِ انْفِتَاحَ مَحْذُورًا عَسَى خَوْفَ اشْتِبَاهِهِ بِمَحْظُورًا عَصَى

(وَخَلِّصِ انْفِتَاحَ) **واتە:** سیفەتی جیابونەوە (انفتاح) لە پیتی (ذ) ئاشکرابکە بۆ نمونە لە ئایەتی (إن عذاب ربّك كان محذورا) نەوەکو لەگەڵ پیتی (ظ) تێکەڵ بێت وەکو لە وشەی (مَحْظُورًا) لە ئایەتی: {وَمَا كَانَ عَطَاء رَبِّكَ مَحْظُوراً}الإسراء٢٠.

هەروەها کەمتەر خەمی مەکە لە دەربڕینی سیفەتی (انفتاح) لە پیتی (س) نەوەکو تێکەڵ بێت لەگەڵ (ص) کە سیفەتی (اطباق)ی تێدایە و، زمان بەرز دەبێتەوە بۆ لای مەلاشوو، وەکو لە وشەی (عَصَى) لەم ئایەتەدا هاتووە (وعصى آدم ربه).

چونکە مەخرەجی (ذ، ظ) هەروەها (س، ص) یەك مەخرەجە بۆیە پێویستە بە سیفەتەکانیان جیاکرێنەوە.

**واتای گشتی ئەم کۆپلەیە:**

**ئەی خوێنەری قورئانی پیرۆز، پیتی (ذ، س) بە سیفەتی (انفتاح) لە پیتی (ظ، ص) جیاکەرەوە چونکە ئەوان (اطباق) یان تێدایە، ئەگینا وشەی (مَحْذُورًا) و (عَسَى) لەگەڵ (حُظُورًا) و (عَصَى) تێکەڵ دەبن.**

٤٩. وَرَاعِ شِـدَّةً بِـكَافٍ وَبِـتَا        كَشِرْكِكُمْ وَتَتَوَفَّى فِتْنَتَا

(وَرَاعِ شِـدَّةً) **واتە: پارێزگاری بکە لە سیفەتی بەهێزیی (شدە).**

(بِـكَافٍ وَبِـتَا) **واتە: کە لە ئەو دوو پیتەدا هەیە، بەوەی کە رێگە نەدەیت کە هەناسە لەگەڵ ئەو پیتانەدا رێبکات.**

**(ك) بۆ نمونە لە وشەی** (شِرْكِكُمْ) **لە ئایەتی:** {وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ}فاطر١٤، **هەروەها وشەکانی:** (تَتَوَفَّاهُمُ) **وەکو نمونەی پیتی (ت) لە فەرمودەی خوای گەورە:** {الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ}النحل٢٨ **و،** (فِتْنَةً) **لە فەرمودەی پەروەردگاری مەزن:** {وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً} الأنفال٢٥.

**تێبینی: زۆرکەس زێدەڕەوی دەکەن لە دەرخستنی سیفەتی (همس) لە (ك) و (ت) بە شێوەیەك پیتێکی تری لێ پەیدا دەبێت، وەکو پیتی (ه) لە (ك) و (س) لە (ت) پەیدادەکەن، بەم شێوەیەش سیفەتی (رخاوة) دەدەنە ئەو پیتە کە خۆی لە بنچینەدا نیەتی، بۆیە پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێت ئەو دوو پیتە دوو پیتی بەهێزن و، نابێت هەوا لەگەڵ دەربڕینیاندا ڕێ بکات ئەمەش ڕێگر نیە لەوەی هەناسە بەشێوەیەکی کەم و لاواز لە گەڵیان دا دەربچێت بە تایبەتی لەکاتی ڕاوەستان دا.**

٥٥٥

## بابەتی تێهەڵکێش کردنی
## (متماثلین) و (متجانسین) و (متقاربین) و (متباعدین)

**واتە: لێکچوو و هاوچەشن ونزیك لەیەکتری ودوور لە یەکتری.**

٥٠. وَأَوَّلَى مِثْلٍ وَجِنْسٍ إِنْ سَكَنْ    أَدْغِمْ كَقُلْ رَبِّ وَبَلْ لاَ وَأَبِنْ

٥١. فِي يَوْمِ مَعْ قَالُوا وَهُمْ وَقُلْ نَعَمْ    سَبِّحْهُ لاَ تُزِغْ قُلُوبَ فَالْتَقَمْ

**پێناسەی زاراوەکان:**

(المتماثلين) **(لێکچوو) واتە:** دوو پیتی هاوشێوە لە مەخرەج و لە سیفەت دا **وەکو:** (ت، ت).

(المتجانسين) هاوچەشن، **واتە:** دوو پیتی هاوشێوە لە مەخرەج و جیاواز لە سیفەت **وەکو:** (د – ط) (ل – ر).

(الإدغام)، **واتە:** تێهەڵکێشانی دوو پیت لە یەك پیتدا.

(وَأَوَّلَى مِثْلٍ وَجِنْسٍ إِنْ سَكَنْ) **واتە:** ئەگەر پیتی یەکەمی دوو پیتە لێکچووەکە یان هاوچەشنەکە زەننەدار (ساکن) بوو، تێهەڵکێشی بکە لەگەڵ پیتی دووەم دا، نمونەیەکیشی هێناوەتەوە بۆ هاوچەشن کە بریتی یە لە (قل رب) لە پاش تێهەڵکێشانەکە دەبێتە (قُرَّبِّ) نمونەیەکی تریشی هێناوەتەوە بۆ لێکچوو کە بریتی یە لە (بل لا) پاش ادغام دەبێتە (بلاّ).

(وَأَبِنْ) **واتە:** ئەم نمونانەی خوارەوە تێهەڵکێشی مەکە:

(فِي يَوْمٍ) لە ئایەتی {فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ}المعارج٤.

یان (قَالُوا وَهُمْ) لە ئایەتی {قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ}الشعراء٩٦.

**واتە: ئەگەر پیتی یەکەم مەد بوو (ادغام) ناکرێت.**

**هەروەها لامی زەننەدار دەردەخرێت لەلای (ن)دا، وەکو:** {قُلْ نَعَمْ وَأَنْتُمْ دَاخِرُونَ} الصافات١٨.

**هەروەها (ح) ی زەننەدار لەلای پیتی (ه) دەردەکەوێت و (ادغام) ناکرێت، چونکە پیتەکانی گەروو دوورن لە تێهەڵکێشانەوە، بە هۆی قورسی ئەوکارە.**

**سوود: بنەمایەکی گرنگ هەیە لە زانستی (تجوید) دا دەڵێت: هیچ پیتێك لە پیتەکانی گەروو (حلق) تێهەڵکێش ناکرێت لەگەڵ پیتێك لە خۆی خوارتر، پیتی هائیش لە خوارەوەی پیتی (ح)ە.**

**هەروەها (غ) لەلای (ق) دا دەردەخرێت، وەکو:** {رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا}آل عمران٨. **بەهۆی جیاوازییانەوە، (غ) لە پیتەکانی گەرووە و، (ق) لە لای زمانە بچکۆلەدایە.**

**بەهەمان شێوە پیتی (ل) لەگەڵ (ت) دەردەخرێت و (ادغام) ناکرێت، وەکو:** {فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ} الصافات١٤٢، **لەبەر دووری مەخرەجەکانیان.**

**واتای گشتی هەردوو کۆپلەکە:**

**لە حاڵەتێکدا دووپیت لێکچوبن یان هاوچەشن، ئەگەر یەکەمی ئەو دوو پیتە زەننەداربوو لەگەڵ پیتی دووەم دا تێهەڵکێشی بکە.**

**وەکو:** (قل رب) و (بل لا).

بەڵام نابێت تێهەڵکێش بکرێت ئەگەر:

پیتی یەکەم پیتی مەدد بوو، وەکو: (فِي يوْمٍ)، ( قَالُواْ وَهُمْ).

لامی زەنندار لەگەڵ نون دا، وەکو: (قل نعم).

حائی زەنندار لەگەڵ (هـ)، وەکو: (سبحه).

(غ) لەگەڵ (ق) دا، وەکو: (ربنا لاتزغ قلوبنا).

(ل) لەگەڵ (ت)دا، وەکو: (فالتقمه).

**ڕوونکردنەوە:**

کەدوو پیت بەدوای یەکدا بن، لە چوار حاڵەت بەدەر نین:

یان لێکچون یان هاوچەشن یان نزیك لەیەکترن یان دوور لەیەکترن.

**یەکەم: لێکچوو (متماثلان):**

ئەو دوو پیتەیە کە یەکیان گرتووە لە مەخرەج و سیفەتدا، وەکو دوو پیتی (ب) لە (اضرب بعصاك) یان دوو (د) لە (وقد دخلوا) یان دوو (ل) لە (قل لن) یان دوو (ن) وەکو: (ومن نعمره).

سوود: (المتماثلان) لێکچوو دابەش دەبنە سێ بەشەوە:

لێکچووی بچووك – لێکچووی گەورە – لێکچووی ڕەها.

**لێکچووی بچووك:** پیتی یەکەم زەنندار (ساکن) بێت و، دووەم بزواو (متحرك) وەکو: (من نعمره – قلْ لن – إضرب بعصاك) ئەم جۆرەش جێگەی باسکردنمانەو پێویستە (ادغام) بکرێت.

**متماثلان:** هەردوو پیتەكە بزواو (متحرك) بن، **وەكو:** (السماءِ إن – إنه هوَ – الرحیم ملك) حوكمی ئەم بەشە دەرحستن (اظهار)ە، لەلای (حفص) و هاوبۆچوونەكان.

**لێكچووی ڕەها:** پیتی یەكەم بزواوبێت و، دووەم زەنندەدار **وەكو:** (نَسخ – ممنون) (إظهار) دەكرێت لەلای هەموو پێشەوایانی خوێندنەوەی قورئان.

**دووەم: (المتجانسان) هاوچەشن:**

ئەو دوو پیتەیە كە یەكیان گرتووە لە مەخرەج داو، لە سیفەتدا جیاوازن، **ئەمەش دەبێتە سێ جۆرەوە:** هاوچەشنی بچووك و گەورەو ڕەها.

**هاوچەشنی بچووك، پێویستە تێهەڵكێش (ادغام) بكرێت، بۆنمونە:**

١. (د) و(ت) **وەكو:** (كدت) (قد تبیّن).

٢. (ت) لە (د – ط) **وەكو:** (اجیبت دعوتكما) و(ودّت طائفة).

٣. (ذ) لە (ظ) **وەكو:** (إذ ظلموا).

٤. (ط) لە (ت) **وەكو:** (بسطت) بەڵام تێهەڵكێشانێكی ناتەواوە (إدغام ناقص)، **واتە:** سیفەتی بەرزی لە (ط)دا هەردەمێنێتەوە.

٥- (ق) لە (ك) دا لە وشەی (نخلقكم) (حفص) بە دوو شێوە دەیخوێنێتەوە: تێهەڵكێشكردنی تەواوو ناتەواو.

٦- (ث) لە (ذ) دا، لە ئایەتی (یلهث ذّلك) (حفص) بە (ادغام) دەیخوێنێتەوە.

٧- (ب) لە (م) دا، لە ئایەتی (اركب مّعنا) (حفص) بە (ادغام) دەیخوێنێتەوە.

هاوچەشنی گەورە: وەكو: (الصالحات طوبی – مريم بهتاناً) (اظهار) دەكرێت.

هاوچەشنی ڕەها وەكو: (لم يشكر)؟ (اظهار) دەكرێت.

**سێ یەم: نزیك لە یەكتری (المتقاربان):**

ئەو دوو پیتەیە لە مەخرەج دا جیاوازن و، لە سیفەتدا نزیكن، ئەویش دابەش دەبێت بۆ سێ بەش: بچووك و گەورەو ڕەها.

ا–نزیك لە یەكتری بچووك: وەكو: (اورثتموا – يرد ثواب).

ب–نزیك لە یەكتری گەورە: وەكو: (نفقد صواع – بعد ضراء).

ج–نزیك لە یەكتری ڕەها: وەكو: (لن – فضرب).

هەموو ئەمانەش (اظهار) دەكرێن، تەنها لە حاڵەتی لامی زەننەدار لەگەڵ (ر) وەكو: (قل رب – بل رفعه).

مامۆستا (محمود خليل الحصري) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە كتێبی (احكام تلاوة القران الكريم) دا لاپەرە (١٣٠) فەرموویەتی:

(ل) و (ر) لەسەر ڕێڕەوی (الفراء) و هاوبۆچونەكانی بە هاوچەشن دەژمێردرێ بە هۆی یەككگرتنەوەیان لە مەخرەج دا، بەڵام لەسەر ڕێڕەوی جومهور كە (الشاطبي و الجزري)یشیان تێدایە، بە (متقاربين) واتە: نزیك لە یەكتری دادنرێن چونكە لە یەكترەوە نزیكن لە ڕووی مەخرەج و سیفەتەوە.

**چوارەم: (المتباعدان) دوور لە یەكتری:**

ئەو دوو پیتەیە كە لە مەخرەج و سیفەتدا دوورن لە یەكتری، ئەویش بە هەمان شێوە دەبێتە سێ بەشەوە: بچووك و گەورەو ڕەها.

✿✿✿

# بابەتی (ض) و (ظ)

ئەمە یەکێکە لە گرنگترین باسەکانی تەجوید، کە (إبن الجزري) باسی هەندێ لەو حاڵەتانەمان بۆ دەکات کە خوێنەران تێی دەکەون، وەکو:

دەربڕینی (ض) وەکو پیتی (ظ)، یان تێهەڵکێش کردنی لەوشەی (أُفضّم) و، شتی تریش کەدواتر باسی دەکەین بەپشتیوانی خوای گەورە.

٥٢. وَالضَّادَ بِاسْتِطَالَةٍ وَمَخْرَجِ مَيِّزْ مِنَ الظَّاءِ وَكُلُّهَا تَجِي

(مَيِّزْ) واتە: پیتی (ض) لە (ظ) جیابکەرەوە بە دوو شت:

١- بە سیفەتی درێژبوونەوە (إستطالة)، چونکە دەستپێکردنی (ضاد) لە سەرەتای قەراغی زمانەوەیە بۆ کۆتاییەکەی، تاکو دەگاتە مەخرەجی پیتی (ل)، بە هۆی ئەو سیفەتە بە هێزانەشەوە کە هەیەتی وەکو: (جهر) و (اطباق) و(إستعلاء) پیتێکی تریش نییە لە نێو پیتەکاندا ئەوندەی (ض) لە سەر زمان قورس بێت، هەر بۆیە لە دەربڕینیدا خەڵکی جیاوازن. هەندێکیان بە (ظ) و هەندێکیان بە (د) و (ط) دەریدەکەن.

یان بە شێوازێك دەریدەبڕن کە بۆنی (ذ)ی لێبێت.

(وَكُلُّهَا تَجِي) واتە: هەموو ئەو وشانەی کە پیتی (ظ)ی تێدایە لە قورئاندا، لەو حەوت کۆپلەی لای خوارەوە دەیانخەینە ڕوو.

٢- بە جێگەی دەرچوونی پیتەکە (مخرج)، چونکە (ض) لە قەراغی زمانەوە دەردەچێت و(ظ) لە سەرەتای زمانەوە دەردەچێت.

## بۆچوونی (دکتۆر غانم قدوري الحمد):

ئەم توێژەرە لەبارەی سیفەتی (الإستطالة) لە پیتی (ض) دەڵێت:

وادیارە ئەم سیفەتە لە خوێندنەوەی زۆربەی قورئانخوێنانی ئەم سەردەمەی خۆماندا بەدینەهاتووە، چونکە بەزۆری لە مەخرەجی(د،ط،ت)ەوە دەریدەکەن، کورتەی کێشەی دەربڕینی ئەم پیتەش لەم ڕۆژگارەی خۆماندا ئەوەیە؛ خوێنەرانی قورئان سیفەتی توندی (الشدّة)ی پێدەدەن و، لەجێگەی دەرچوونی پیتی (ط)ەوە دەریدەبڕن بەزۆری، هەندێکیشیان سیفەتی نەرمیی (الرّخاوة)ی پێدەدەن، ئەم دوو شێوازەش هەڵەن و ناگونجێن لەگەڵ ئەو باسانەی لە کتێبەکاندا دەربارەی (ض) هاتوون، چاکتریشە خوێنەر لەم سەردەمەدا بەپێی ئاڕاستەی مامۆستاکەی ئەو پیتە بخوێنێتەوە و، واز لە کێشەی پیتی (ض) بهێنێت بۆ توێژینەوە مێژووییەکان[١].

٥٣. فِي الظَّعْنِ ظِلِّ الظُّهْرِ عُظْمِ الحِفْظِ　　أَيقِظْ وَأَنظِرْ عَظْمِ ظَهْرِ اللَّفْظِ

(ظَعْنِ) واتە: گەشت، تەنها لە یەك جێگەدا لە قورئان هاتووە: {يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ} النحل٨٠.

(ظِلّ) واتە: سێبەر، لە بیست و دوو جێگەی قورئاندا هاتووە، وەکو: (ظلا ظليلا – يوم الظلة – وظللنا).

---

١ الشرح الوجيز على الجزرية / ٥٣-٥٤.

**(الظُّهر) واتە:** نیوەڕۆ، **لە دوو جێگەی قورئاندا هاتووە:** {وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ} النور٥٨، {وَحِينَ تُظْهِرُونَ} الروم١٨.

**(عُظْم) واتە:** مەزنی، **لە (١٠٣) جێگەی قورئاندا هاتووە، وەکو:** (العلي العظيم – اعظم درجة – ميلا عظيما).

**(الحِفظ) واتە:** پاراستن، **لە چل و دوو جێگەی قورئاندا باسکراوە، وەکو:** (وما انا عليكم بحفيظ – ولا يؤوده حفظها – حافظوا على الصلوات).

**(أيقظ)** لە (اليقظة)ەوە هاتووە، **واتە:** بێداری، تەنها لە یەك ئایەتدا باسکراوە: {وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً} الكهف١٨.

**(أنظُر) واتە:** چاوەڕوانی، **لە بیست جێگەی قورئاندا هاتووە، وەکو:** (ولا هم ينظرون – انظرونا نقتبس من نوركم).

**(عَظْم) واتە:** ئێسك، **لە پانزە جێگەی قورئاندا هاتووە، وەکو:** (وهن العظم – رفاتا و عظاما – عظاما نخرة).

**(ظَهر) واتە:** پشت، **لە شانزە جێگەی قورئاندا باسکراوە، وەکو:** (وراء ظهورهم – على ظهورهم – الذى انقض ظهرك).

**(اللَّفظ) واتە:** وشە، **لە یەك جێگەی قورئاندا هاتووە:** (ما يلفظ من قول).

٥٤. ظَاهِرُ لَظًى شُوَاظُ كَظْمٍ ظَلَمَا      اُغْلُظْ ظَلاَمَ ظُفُرٍ اُنْتَظِرْ ظَمَا

**(ظَاهِرُ) پێچەوانەی (باطن)، شەش واتای هەیە، لە چل و یەك جێگەی قورئاندا باسكراوە:** (ظاهر الاثم –الظاهر و الباطن – وظاهره من قبله العذاب).

**(لَظًى) یەكێكە لە ناوەكانی دۆزەخ خوا پەنامان بدات، تەنها لە دوو ئایەتدا باسكراوە:** {نَاراً تَلَظَّى} الليل١٤، {كلا انها لظى} المعارج ١٥.

**(شُوَاظُ) واتە: بڵێسەی بێ دوكەڵ، لە یەك جێگەی قورئاندا باسكراوە:** {يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ} الرحمن٣٥.

**(كَظْمٍ) واتە: خواردنەوەی ڕق و قین و دەرنەبڕینی، لە شەش جێگەی قورئاندا باسكراوە، وەكو:** {وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ} آل عمران١٣٤.

**(ظَلَمَا) واتە: ستەم، یان دانانی شت لە جێگەی نەگونجاوی خۆی، لە دووسەدو هەشت جێگەی قورئاندا باسی هاتووە، وەكو:** (الظالمين – ظالم).

**(اُغْلُظْ) لە (الغلظة)ەوە هاتووە واتە: زبری، لە سیانزە جێگەی قورئاندا باسكراوە، وەكو:** (غليظ القلب – واغلظ عليهم).

**(ظَلاَمَ) واتە: تاریكی، زانایان جیاوازیان لە نێواندایە سەبارەت بە ژمارەی باسكردنی لە قورئاندا، (ابن الجزري) لە كتێبی (التمهيد)لاپەڕی/٨٠ فەرموویەتی:**

بیست و شەش جار باسکراوە، بەڵام کوڕەکەی کە ناسراوە بە (إبن الناظم) دەڵێ سەد جار باسکراوە لە قورئاندا.

بەڵام بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە (إبن الجزري) هەڵیبژاردووە کە بیست و شەش جێگەیە، هەندێ زانای گەورەش لە سەر ئەم بۆچوونەن، وەکو: (على النوري الصفاقسى) لە کتێبی (تنبية الغافلين) لاپەڕەی٧٤، هەروەها (الملا علي القاري) و (إبن بالوشة) لە (شرح المقدمة الجزرية) لاپەڕەی /٣٥، نموونەی ئەم وشە لە قورئاندا: (فِي ظلمات).

(ظُفُر) واتە: نینۆک، لەیەك جێگەی قورئاندا باسکراوە: {حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ}الأنعام١٤٦.

(أنـظِـرْ) واتە: چاودێریکردن، لە بیست و شەش جێگەی قورئاندا هاتووە، وەکو: (قل انظروا) (هل ينظرون).

(ظَـمَـا) واتە: تینوێتی، لە سێ جێگەی قورئاندا باسکراوە، وەکو: {لاَ يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ}التوبة١٢٠، {وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا}طه١١٩.

٥٥ . أَظْفَرَ ظَنًّا كَيْفَ جَا وَعَظْ سِوَى عِضِينَ ظَلَّ النَّحْلُ زُخْرُفٍ سَوَى

(أَظْفَرَ) واتە: سەرکەوت، لەیەك جێگەی قورئاندا هاتووە { مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ}الفتح٢٤.

(ظَنًّا كَيفَ جَا) **واتە: وشەی (ظن) كە گومان دەگەیەنێ لەهەر جێگەیەكی قورئاندا هاتبێت — لە شەست و نۆ جێگەی قورئاندا بە هەموو واتاكانیەوە هاتووە وەكو:** (يظنون ــ ظنتم).

(وَعَظ) لە (وَعْظ)ەوە هاتووە، **واتە:** ئامۆژگاری، بۆچوونی پەسەند ئەوەیە لە **بیست وچوار جێگەی قورئاندا هاتووە وەكو:** (وموعظة ـ وعظهم ـ توعظون) (سوى عضين) **واتە:** وشەی (عضين) بە (ظ) نیە لە ئایەتی: {الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ} الحجر٩١.

(ظَلَّ) **واتە:** بەردەوام بوو، **لەنۆ جێگەی قورئاندا باسكراوە، وەكو:** {ظَلَّ وَجْهُهُ} النحل٥٨، {فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ} الواقعة٦٥.

(النَّحْلُ زُخْرُفٍ سَوَى) **واتە:** دووانی بریتین لەئایەتێكی هاوشێوە لە **هەردوو سورەتەكەدا ( ٥٨/ النحل ــ ١٧/ الزخرف).**

٥٦ . وَظَلْتُ ظَلْتُمْ وَبِرُومٍ ظَلُّوا كَالْحِجْرِ ظَلَّتْ شُعَرَا نَظَلُّ

**ئەم كۆپلەیە تەواوكەری داهاتووە لە ئەژماركردنی وشەی (ظل) كە بەواتای بەردەوامی هاتووە لە قورئاندا، دوو جێگەی لە كۆپلەی داهاتوودایە لێرەشدا حەوت وشەكەی تری دەخاتە ڕوو:**

(ظَلْتُ) لە ئایەتی: {ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا} طه٩٧.

(ظَلْتُمْ) لە ئایەتی: {فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ} الواقعة٦٥.

(بِرُوم ظَلُّوا) **واتە: لە ئایەتی** {لَظَلُّوا مِن بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ} الروم٥١.

(كَالْحِجْرِ) واته: وەكو ئەوەی له ئایەتی {فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ}الحجر١٤

(ظَلَّتْ شُعَرَا) واته: له ئایەتی: {فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ}الشعراء٤.

(ظَلَّتْ شُعَرَا) واته: لەئایەتی { فَنَظَلُّ لَهَا }الشعراء٧١، (نَظَلُّ) له كۆپلەی داهاتوودا واته: له ئایەتی {فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَى ظَهْرِهِ}الشورى٣٣، تەواوكەری تۆ جێگەكەیە.

٥٧ . يَظْلَلْنَ مَحْظُورًا مَعَ الْمُحْتَظِرِ          وَكُنْتَ فَظًّا وَجَمِيعِ النَّظَرِ

(مَحْظُورًا) واته: قەدەغە كراو له یەك جێگەی قورئاندا باسكراوە: {وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُوراً}الإسراء٢٠، (مَعَ الْمُحْتَظِرِ) واته: خاوەنی شووره، له یەك جێگەی قورئاندا باسی هاتووە، {فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ}القمر٣١.

(وَكُنْتَ فَظًّا) له (الفظاظة)ە وە هاتووە، واته: ڕەقی و زبری. له یەك جێگەی قورئاندا باسكراوە {وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ} آل عمران١٥٩.

(وَجَمِيعِ النَّظَرِ) (النظر) واته: تەماشاكردن یان بیركردنەوە، هەشتاو چوار جار له قورئاندا باسی هاتووە بۆ نموونە: {وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ}الأعراف١٩٨، {وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ}البقرة٥٠.

٥٨ . إِلاَّ بِوَيْلٌ هَلْ وَأُولَى نَاضِرَهْ          وَالْغَيْظِ لاَ الرَّعْدِ وَهُودٍ قَاصِرَهْ

(وَجَمِيعِ النَّظَرِ إِلاَّ بِوَيْلٌ هَلْ وَأُولَى) واته: هەموو بابەتی وشەی (النظر) بە ڕەهایی كه له قورئاندا هاتووە بە پیتی (ظ) جگە لە (نضرة) نەبێت له سورەتی (المطففين)، هەروەها وشەی (نضرة وسرورا) له سورەتی (الإنسان).

(وَالْغَيْـظِ) واتە: تووڕەیی زۆر و هەڵچوون، لە یانزە شوێنی قورئاندا هاتووە، وەکو: {مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ}آل عمران١١٩، {تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ}الملك٨.

(الرَّعْـدِ) واتە: فەرموودەی خوای گەورە {وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ}الرعد٨ و، لە سورەتی (هُـودٍ) {وَغِيضَ الْمَاء}٤٤.

ئەم دوو وشە بە (ظ) نین و، بە (ض)ن...

(قَـاصِرَهْ) واتە: جگە لە دوو وشە لە قورئاندا نەهاتووە.

٥٩. وَالْحَظُّ لاَ الْحَضُّ عَلَى الطَّعَامِ وَفِـي ضَنِيْنٍ الْخِلاَفُ سَامِي

(وَالْحَظُّ) واتە: پشك، لە حەوت جێگەی قورئاندا باسکراوە... وەکو: {يُرِيدُ اللّهُ أَلاَّ يَجْعَلَ لَهُمْ حَظّاً فِي الآخِرَةِ} آل عمران١٧٦.

(لاَ الْحَضُّ عَلَى الطَّعَامِ) ئاگادارمان دەکاتەوە کە (حض) بەپیتی (ض) کە بەمانای هاندان دێت جیاوازەو لێرەدا باسەکە ئەو وشە ناگرێتەوە، ئەم وشەیەش لە سێ جێگەی قورئاندا باسکراوە، وەکو: {وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ }الحاقة٣٤.

(وَفِـي ضَنِيْنٍ) بە (ض) واتە: چرووك.

(الْخِلاَفُ سَامِي) ڕاجیاییەکی بەناوبانگ هەیە دەربارەی، چونکە لە قیرائەتێکدا بە (ظنین) هاتووە، واتە: تۆمەتبار لە خوێندنەوەی (حفص) دا بە (ض) هاتووە.

٦٠. وَإِنْ تَلاَقَيَا الْبَيَانُ لاَزِمُ      أَنقَضَ ظَهْرَكَ يَعَضُّ الظَّالِمُ

٦١. وَاضْطُرَّ مَعْ وَعَظْتَ مَعْ أَفَضْتُمُ      وَصَفُّ هَا جِبَاهُهُم عَلَيْهِمُ

(وَإِنْ تَلاَقَيَا) **واتە: ئەگەر هەردوو پیتی (ض) و (ظ) یەكیان گرت ئەوە بزانە كە پێویستە لە سەرت هەڵسی بەئەنجامدانی ڕوونكردنەوە واتە هەردوو پیتەكە ڕوونكەیتەوە بەجوانی دەریانبخەیت.**

(لاَزِمُ) **واتە: ئەو كارە پێویستە لە سەرت، بۆنموونە وەكو:** {انقِضْ ظَهْرَكَ} النوح٣، **لێرەدا لەوانەیە زمان پێشكەوێت بۆ دەربڕینی (ض) وەكو (ظ) یان وەكو:** {يَعَضُّ الظَّالِمُ} الفرقان٢٧.

**پاشان ئاگاداری دەدات دەربارەی دەرخستنی (ض) لە وشەی (اضْطُرَّ) نەوەكو (ادغام) بكرێت لە پیتی (ط) هەروەها وریابە لەتێهەڵكێشانی پیتی (ظ) لەپیتی (ت) لە وشەی (وَعَظْتَ) بەڵكو پێویستە بە جیا هەر دوو پیتەكە دەربخەیت، بە هەمان شێوە وریابە لە (ادغام)كردنی پیتی (ض) لە پیتی (ت) دا لە وشەی (أَفَضْتُمْ) بەڵكو پیویستە بە جوانی (ض) دەربخەیت.**

**(إبن الجزري) لە كتێبی (النشر في القراءات العشر) لاپەرە ٢٢٠ دەفەرموێت:**

**(پیویستە خوێنەری قورئان ڕاهێنان بكات لەسەر كارامە بوون لە دەربڕینی پیتی (ض) بە تایبەتی كاتێك بە تەنیشت پیتی (ض)ەوە بێت وەكو: (انقض ظهرك) و (یعض الظالم)، یان كاتێك نزیكی پیتیكی گەورە دەبێت وەكو: (الأرض-اللّه) یان نزیكی**

پیتێکی هاوچەشنی خۆی بێت وەکو: (الأرض ذهبا) یان کاتێك (ساکن) بێت و، یەکێك لە پیتەکانی (اطباق)ی بە دوادا بێت وەکو: (فمن اضطر – افضتم- وخضتم - تضليل).

(وَصَـفَّ) واتە: بە ڕوونی دەریببڕە.

(هَـا جِبَاهُهُـم) واتە: هەردوو پیتی (ه) لەم وشەیە بە جوانی ئاشکرا بکە.

(عَلَيْهِمُ) بەهەمان شێوە پیتی (ه) لەم وشەیە بە جوانی دەریببڕەوە، لە پیتە هاوشێوەکانیشی وەکو: (جنوبهم – اليهم – يزكيهم) چونکە پیتی (ه) پیتێکی لاوازە و شاراوەیە پێویستە خوێنەر کۆشش بکات بۆ جوان دەرخستنیان.

٥٥٥

# بابەتی مینگە (غنَّة) لە هەردووو پیتی (م) و (ن)ی (شدة)داردا

٦٢. وأَظْهِرِ الغُنَّةَ مِنْ نونٍ وَمِنْ مِيْمٍ إِذَا مَا شُدِّدَا وَأَخْفِيَنْ

(وأَظْهِرِ الغُنَّةَ مِنْ نونٍ ومِنْ) **واتە: مینگە بە ڕوونی دەربخە لە هەردوو پیتی (ن-م)، مینگەش سیفەتێکی هۆگرە بۆ ئەم دوو پیتە لە هەموو حاڵەتێکدا، زەنندار بن یان بزواو، ئاشکرا بن یان تێهەڵکێش کراو.**

(وَأَخْفِيَنْ) **واتە: بیشارەوە.**

## پایەکانی مینگە (غنة)

**هەموو (غنة)یەك لە پیتەکاندا وەکو یەك نین بەڵکو جیاوازییان تێیدایە وەکو مامۆستا (ایمن سوید) ڕوونیان دەکاتە بەم شێوەی لای خوارەوە.**

١. **تەواوترین مینگە (أكمل ماتكون): لە پیتی نون و میمی (شدّە) دار و تێهەلکێشدایە وەکو:** (الجنّة – لن نّصبر – حمّالة الحطب – لكمْ مّاكسبتّم).

٢. **مینگەی تەواو (غنّة كاملة): لە نون و میمی شاراوەدایە وەکو:** (ترميهمْ بحجارة – الإنسان) **هەروەها لە نونی هەڵگێڕاوە وەکو: (انبئهم) ئەمەش کەمێك لە شاردنەوە کورتترە، بەڵام مینگە لە هەردوکیاندا هەر درێژە.**

**٣. مینگەی ناتەواو (غنة ناقصة): لە نون و میمی زەنن‌ەدار ئاشکرا کراودایە وەکو:** (الرحيم – من امن) کەمێك درێژ دەکرێتەوە چونکە ئەم دوو پیتە سیفەتی (بينية) یان تێدایە.

**٤. ناتەواوترین مینگە (أنقص ما تكون): لە نون ومیمی بزواو (متحرك) دایە وەکو:** (نمارق مصفوفة).

**واتە:** هەردوو پیتی (ن) و (م) بە مینگە دەردەبڕدرێت، بەلاَم بەم پێ یەی کە ڕوونمان کردەوە.

٦٣. الْمِيْمَ إِنْ تَسْكُنْ بِغُنَّةٍ لَدَى بَاءٍ عَلَى الْمُخْتَارِ مِنْ أَهْلِ الأَدَا

(الْمِيْمَ إِنْ تَسْكُنْ بِغُنَّةٍ لَدَى بَاءٍ) **واتە:** ئەگەر پیتی (م) زەننەدار (ساكن) بوو لەلای پیتی (ب) دەشاردرێتەوە **واتە:** (اخفاء) دەکرێت.

(عَلَى الْمُخْتَارِ مِنْ أَهْلِ الأَدَا) **واتە:** بە پێ ی بۆچوونی پەسەندی مامۆستایانی شارەزا لەم زانستە کە (إبن الجزري) خۆیشی یەکێکە لەو کەسانە. بۆچونێکی تریش هەیە کەم کەس لە زانایان کاری پێدەکەن ئەویش بریتییە لە دەرخستنی (م)ی زەننەدار کە لەگەڵ پیتی (ب) کاتێك یەکبگرن.

**بۆنموونە:** (ومن يعتصمْ باالله) (وهمْ بالآخرة).

**واتای گشتی کۆپلەکە:**

ئەگەر میمی زەننەدار لەگەڵ پیتی (ب) یەکبگرن بەپێی بۆچوونی پەسەند (إخفاء)ی بکە.

٦٤. وَأَظْهِرَنْهَا عِنْدَ بَاقِي الأَحْرُفِ    وَاحْذَرْ لَدَى وَاوٍ وَفَا أَنْ تَخْتَفِي

(وَأَظْهِرَنْهَا) **واتە: ئاشكرای بكە و (اخفاء)ی مەكە.**

(عِنْدَ بَاقِي الأَحْرُفِ) **لەگەڵ پیتەكانی تر، ئیتر ئایا لە یەك وشەدا وەكو: (انعمت) یان لە دوو وشەدا بێت، وەكو:** (مثلهمْ كمثل)، (ذلكمْ خير لكمْ عند بارئكم).

(وَاحْذَرْ) **وریابە.**

(لَدَى وَاوٍ وَفَا أَنْ تَخْتَفِي) **لەوەی بشاردرێتەوە كاتێك لەگەڵ پیتی (و – ف) یەكدەگرن، وەكو:** (هم فيها خالدون) (عليهم ولا).

**چونكە لەگەڵ (و) مەخرەجیان یەكێكە و لەگەڵ پیتی (ف)یش مەخرەجیان نزیكە.**

**تێبینی: زۆر لە خوێنەرانی قورئان دەكەونە هەڵەی شاردنەوەی (م) كاتێك بە تەنیشتی (ف) ەوە بێت بۆیە پێویستە لەو هەڵەیە وریا بن و خۆیان ڕابهێنن لەگەڵ دەرخستنیدا.**

**واتای گشتی:**

**ئەی خوێنەری قورئان وشەی (م) جگە لەو كاتەی لەگەڵ پیتی (ب) یەكدەگرن پێویستە بیشاریتەوە، لەگەڵ هەموو پیتەكانی تر بە ئاشكرا بیخوێنەرەوە بەتایبەتی لەگەڵ هەردوو پیتی (و) و (ف).**

**سوود: لە كاتی (اخفاء) كردنی پیتی (م) و (ب) وریابە بە تەواوەتی و بە توندی لێوەكانت دانەخەیت، بەڵكو تەنها بە ئەسپایی لە یەكتر بدەن.**

زانای بە ناوبانگ (المرعشی) وەكو لە كتێبی (احكام تلاوة القران/١٨٠)دا هاتوە دەڵێت: وا دەردەكەوێت (اخفاء)ی پیتی (م) واتای ئەوە ناگەیەنێت كە بە تەواوی پیتەكە بشاریتەوە. بەلكو لاوازی بكەیت و، دایپۆشیت لە ڕێگەی پشت نەبەستنی زۆر بە مەخرەجەكەی كە لێوە.

مامۆستا (محمد منیار) لە كتێبی (الملاحظات الهامة) لاپەڕەی ٦٨ دەڵێت:

پێویستە داخستنی لێوەكان لە كاتی دەربڕینی پیتی (م) بە هێواشی بێت چونكە واتای شاردنەوە (الإخفاء) ئەوەیە پشت بەستنی كەم بكەین لەسەر مەخرەج نەك وازهێنان لە مەخرەج بە جاریٚ، خوێنەرانیش لە دەربڕینی ئەم پیتەدا دوو جۆر هەڵە دەكەن: یان لێویان بە توندی دادەخەن و، یان بۆشاییەكی كەم لە نێوانیاندا دەهێڵنەوە، ڕاستەكەشی ئەوەیە كە باسمان كرد.

۞۞۞

# یاساكانی نونی زەننەدار و تەنوین

پیتی (ن)ی زەننەدار (ساكن)، دەكرێت لە ناو دا هەبێت، وەكو: (المنتهى – الانهار) دەكرێتیش لە پیتدا بێت، وەكو: (من – عن) لە ناوەڕاست و كۆتایی وشەشدا دێت و، هەرگیز لە سەرەتایی وشەوە نایەت، چونكە سەرەتای وشە هەمیشە دەبێت بزواو(متحرك) بێت.

سوود: دەستپێكردن پێچەوانەی ڕاوەستانە، چونكە وەكو چۆن ناكرێت وشە بە پیتی (ساكن) دەست پێ بكرێت، ناشكرێت بە بزواو لەسەر كۆتایی وشە ڕاوەستین.

٦٥. وَحُكْمُ تَنْوِينٍ وَنُونٍ يُلْفَى      إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ اخْفَا

(وَحُكْمُ تَنْوِينٍ وَنُونٍ) واتە: یاسای پیتی نونی زەننەدار و تەنوین واتە: (دوو سەرو، دوو بۆرو، دوو ژێر).

(يُلْفَى) واتە: هەیە لەم حاڵەتانەی لای خوارەوە: (إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ اخْفَا) واتە: ئاشكرا كردن و تێهەڵكێشان و هەڵگەڕانەوە و شاردنەوە.

واتای گشتی:

یاسای تەنوین و نونی زەننەدار خۆی دەبینێتەوە لە حاڵەتەكانی ئاشكرا كردن و تێهەڵكێشان و هەڵگەڕانەوە و شاردنەوە.

٦٦. فَعِنْدَ حَرْفِ الْحَلْقِ أَظْهِرْ وَادَّغِمْ      فِي اللاَّمِ وَالـرَّا لاَ بِغُنَّةٍ لَـزِمْ

٦٧. وَأَدْغِمَنْ بِغُنَّةٍ فِي يُومِنُ      إلاَّ بِكِلْمَةٍ كَدُنْيَا عَنْوَنُوا

پێشەوا (إبن الجزری) لەم دوو کۆپلەیەدا یاسای ئاشکراکردن و تێهەڵکێشانمان لە قورئاندا بۆ ڕوون دەکاتەوە.

(حَرْفِ الْحَلْقِ) **واتە:** پیتەکانی گەروو.

(أَظْهِرْ) **واتە:** نونی زەننەدار و تەنوین ئاشکرا بکە کاتێك دەکەونە پێش یەکێك لە پیتەکانی گەروو، کە شەش پیتن: (ء – هـ – ع – ح –غ – خ).

**پێناسەی** (الاظهار):

لە زمانەوانیدا: **واتە:** ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردن.

لە زاراوەدا **واتە:** دەرخستنی نون بە تەواوی بەبێ هیچ دەستکاریەك لە سیفەتەکانی.

**سوود:** هۆکاری ئاشکرا کردن (الإظهار) دووریی مەخرەجی پیتی نونە لە مەخرەجی شەش پیتەکانی ئاشکراکردن، بۆیە هیچ نزیکبوونەوە یان لێکچونێك نیە لە نێوانیاندا.

**ئاشکراکردن (اظهار) سێ پایەی هەیە:**

**یەکەم:** بەرزترین پایەی کە لە هەموویان ڕوونترە. دەرخستنی نونی زەننەدار و تەنوینە لەگەڵ هەردوو پیتی (ء– هـ) چونکە دوور ترین پیتەکانی (گەروو)ن لە پیتی نونەوە.

**دووەم:** پایەیەکی مام ناوەندی لەگەڵ (ع – ح) چونکە ناوەڕاستی گەرووە.

**سێ یەم:** نزمترین پایەی لەگەڵ (غ – خ) چونکە نزیکترین پیتەکانی گەروون لە مەخرەجی پیتی نونەوە.

**ئاماژە:** ئەم جۆرە (اظهار)ە پێیی دەوترێت (اظهار حلقي) ئەمەش هەندێ نمونەی ئاشکراکردنی پیتی نونە لەگەڵ پیتەکانی گەروو:

**لە دوو وشەدا وەکو:** (مَنْ امن – مَنْ هاد – مَنْ عند – مَنْ غير – ولَمَنْ خاف).

**لە یەك وشەدا وەکو:** (ينأون – منهم – الانعام – ينحتّون).

ئەمەش هەندێ نمونەی ئاشکرا کردنی تەنوینە لەگەڵ پیتەکانی گەروو کە تەنها لە دوو پیتدا دروست دەبن **وەکو:** (عذابٌ اليم – سلامٌ هي – حكيمٌ عليم – غفورٌ حليم – ربٌ غفور – علياً خيراً).

(وَأَدْغِمَنْ) لێرەوە (إبن الجزري) باسی یاسای دووەممان بۆ دەکات کە بریتی یە لە تێهەڵکێشان (الإدغام):

**پێناسەی** (الادغام):

لە زمانەوانیدا: **واتە:** تێهەڵکێشان. لە عەرەبیدا دەوترێت: (ادغمت اللجام في فم الفرس – لەغاوەکەم لەدەمی ئەسپەکە هەڵکێشا) **واتە:** لە یەکگرتنی دوو پیت و، دوومیان بزواو (متحرك) بێت لەو حاڵەتەدا پیتی یەکەم لا دەبەین لە دەربڕیندا و، پیتی دووەم (شدة) دار دەکەین.

**تێهەڵکێشان (ادغام) یش دەبێتە دوو بەشەوە:**

**یەکەم: تێهەڵکێشانی تەواو، واتە: تێهەڵکێشانی بێ مینگە، ئەمەش لە هەردوو پیتی (ل – ر) دا دروست دەبێت، ئەوەش مەبەستی (إبن الجزري) کە فەرمویەتی:**
(فِي اللاَّمِ وَالـرَّا لاَ بِغُنَّـةٍ لَـزِمْ).

**نمونەی ئەم جۆرە:** (فانْ لم يفعلوا – هدىً للمتقين – منْ ربهم – من ثمرةٍ رزقاً).

**دووەم: تێهەڵکێشانی ناتەواو، واتە: مینگە دار، ئەم جۆرەش لەگەڵ پیتەکانی وشەی (یومن)[1] دروست دەبێت، ئەمەش واتای فەرموودەی (إبن الجزري):**

(وَأَدْغِـمَـنْ بِغُنَّـةٍ فِـي يُـومِـنْ) **نمونەی ئەم جۆرە:** (منْ يقول – منْ ورائهم – وجناتٍ وعيون).

(إلاَّ بِكِلْمَـةٍ كَدُنْيَـا عَنْوَنُـوا) **واتە: ئەگەر لە حاڵەتێکدا دوو پیتەکە لە یەك وشەدا بوون وەکو وشەی (دُنیا)، یان (صنْوان) و (قنْوان) و (بنْیان) لەم چوار وشەی قورئاندا دروست نیە (ادغام) بکرێت بەڵکو پێویستە (اظهار) بکرێت.**

**بۆچی تێهەڵکێشان لەو چوار وشەیە دروست نیە؟**

**مامۆستا (محمود خليل الحصري) لە کتێبی (احکام تلاوة القران الكريم) لاپەڕە ١٧٦ دەفەرموێت:– هۆکاری (ادغام) نەکردن لەو چوار پیتە مەترسی تێکچونی واتاکەیە وەکو: (صنْوان)، دروست نیە بڵێین: (صوّان) یان (دنیا) چونکە لەو حاڵەتەدا بنچینەی وشەکە نازانرێت چیە[2].**

---

[1] هەندێکیش بە وشەی (ینمو) دایانرێژاوە.

[2] بڕوانە: اللمعة البدرية في شرح متن الجزرية /٦٩.

سوود: (ادغام)ی مینگەدار، بۆیە بەناتەواو ناو دەبرێت، چونکە پیتی نون (ادغام) دەکەین، بەڵام سیفەتی مینگەی تێدا دەهێڵینەوە.

(ادغام)ی بێ مینگەش بۆیە ناونراوە (ادغام)ی تەواو چونکە نونەکە بە تەواوەتی تێهەڵکێش دەکەین و هیچ سیفەتێکی ناهێڵینەوە.

✡✡✡

## هەڵگەڕاندنەوە و شاردنەوە
## (الإقلاب و الإخفاء)

٦٨ . وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا　　　لاخْفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِـذَا

**(وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا) واتە: هەڵگەڕاندنەوەی نون و تەنوین لەگەڵ پیپیتی (ب) و گۆڕینی بۆ میمێکی شاراوە پێویستە وەکو: (أَنبِئهم – مِنْ بعد – صمٌّ بكم).**

**سوود: (إبن الجزري) لەکتێبی (تقريب النشر) لاپەڕە ١٣٢ دەڵێت: (دوو پیپتی نون وتەنوین لەلای پیتی (ب) دەکرێتە میمێکی پەتی بەلاّم "اخفاء" دەکرێت)[1].**

**پێناسەی (القلب)[2]:**

**لەزمانەوانیدا: واتە: هەڵگەڕانەوە.**

**لەزاراوەدا: گۆڕینی پیتێك بۆ پیتێکی تر لەگەڵ ڕەچاوکردنی مینگە و شاردنەوە لەپیتی یەکەمدا، واتە: گۆڕینی نونی زەننەدار (ساکن) لەدەر بڕیندا بۆ پیتی (م) ئەگەر پیتی (ب) ی بەدوادابێت. هاوکات لەگەڵ (اخفاء) کردنی میمەکە.**

---

١ نونی زەننەدار و تەنوین ئاشکرا دەکرێن کاتێك یەك بگرن لەگەڵ پیتەکانی گەروو کە بریتین لە ( ء، هـ، ع، ح، غ، خ) بەلاّم کاتێك لە گەڵ هەر دوو پیتی ( ل، ر) یەکبگرن تێهەڵکێش دەکرێن بەتەواوی و بەبێ مینگە، ئەگەر لەگەڵ چوار پیتی وشەی ( يومن) یەکبگرن تێهەڵکێشی ناتەواوی مینگەدار دەکرێن تەنها لە چوار وشەدا نەبێت لە قورئان پێویستە ئاشکرا بکرێن ، ئەو وشانەش بریتین لە: ( دنيا – صنوان – قنوان – بنيان) .

٢ لە کتێبی ( احكام التلاوة)ی ماموستا (الحصري) داهاتووە کەوشەی (الاقلاب) لەڕووی زمانەوانی یەوەهەڵەیەوە ڕاست و دروست ئەوەیە بڵێین (قلب) نەك (اقلاب)!

(لاخْفَا لَدَى) واتە: شاردنەوەش بەهەمان شێوە.

**پێناسەی (الاخفاء):**

لەزمانەوانیدا واتە: شاردنەوە.

لەزاراوەدا واتە: کاتێك نون و تەنوین بکەوێتە پێش پیتەکانی تر کەبریتین لە پانزە پیت دەشار درێتەوە.

**پیتەکانی (الاخفاء):** (ص – ذ – ث – ك – ج – ش – ق – س – د – ط – ز – ف – ت – ض – ظ).

ئەم پیتانەش لە سەرەتای پیتەکانی ئەم دێرە دا کۆکراوەتەوە:

**صف ذا ثنا كم جاد شخص قد سما    دم طيبا زد في تقى ضع ظالما**

نمونەی (اخفاء): (ينصركم – ءأنذرتهم – منشورا – ينكثون – وانجينا – منشورا – ينقلب – منسأته – أندادا – ينطقون – أنزلنا – أنفقوا – كنتم – منضودا – ينظرون)[١].

**پایەکانی شاردنەوە سێ پایەن:**

١– **بەرزترین شاردنەوە:** لەپیتەکانی (ط – د – ت)ە بەهۆی نزیکیان لە مەخرەجی نونی زەننەدارو تەنوینەوە.

٢– **نزمترین شاردنەوە:** لەپیتەکانی (ق – ك)ە بەهۆی دووریی مەخرەجیان لەپیتی نونی زننەدارو تەنوینەوە.

---

١ بڕوانە: الجامع في تجويد قراءة القران الكريم / ٧٧ .

٣- شاردنەوەی مام ناوەند: لە پیتەكانی تردایە چونكە مەودایەكی مام ناوەندیان هەیە لە مەخرەجی نونەوە[١].

**چۆنیەتی دەربڕینی شاردنەوە (الأخفاء):**

١- خوێنەر خۆی بۆ ئامادە دەكات لەپێش پیتی نونەوە، واتە: بۆنمونە لەپیتی (فانذر) خوێنەر دەمی ئامادە دەكات لە مەخرەجی هەمزەوە بۆ مەخرەجی (ذ).

٢- هاوكات پێویستە (غنة) واتە: مینگەی لەگەڵدا ئەنجام بدرێت.

٣- دەنگێكی كەمیش لەدەمەوە دەر دەچێت بەهۆی دانەخستنی مەخرەجی نون بەلاَم دەبێت مینگەكە زۆر بێت ٧٥٪ مینگە، ٢٥٪ لە دەمەوە[٢].

سوود: گەورەیی و بچوكی مینگە لە حاڵەتی شاردنەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی و نزمی پیتەكە، بۆ نمونە: مینگە گەورە دەكرێتەوە ئەگەر بە دوای نونی زەننەدارو تەنویندا پیتێكی بەرز بێت: (ص – ض – ط – ظ – ق)، وەكو: (ينصركم – منضود – ينطقون – فانظر – ينقلب).

٭٭٭

---

١ بڕوانە: الميسر الفريد / ١٠٤ ، غاية المريد / ٦٥ .

٢ ئەمە بۆچونی دكتۆر ( ايمن سويد )ە، لەكتێبی النور المبين /٤٠ .

# بابەتی مەددەکان

٦٩. وَالمَدُّ لاَزِمٌ وَوَاجِبٌ أَتَى ... وَجَائِزٌ وَهْوَ وَقَصْرٌ ثَبَتَا

**واته:** جۆرەکانی مەدد بریتین لە مەددی (لاَزِمٌ) و (وَاجِبٌ) و (جَائِزٌ).

**پێناسەی (المد):**

لە زمانەوانیدا **واته:** زیادە.

لەزاراوەدا **واته:** درێژکردنەوەی دەنگ بەیەکێك لە پیتەکانی مەدد.

پیتەکانی مەدد بریتین لە:

(ا) ئەلفی زەننە دار پیتی پێش خۆی سەر (فتحة)ی هەبێت وەکو: (قال).

(و) واوی زننەدار پیتی پێش خۆی بۆر (ضمة)ی هەبێت وەکو: (یقول).

(ي) یائی زەننەدار پیتی پێش خۆی (کسرة)ی هەبێت وەکو: (قیل).

هەموو پیتەکانی مەددیش لەوشەی (نوحیها) کۆبونەتەوە[١].

**مەدد دوو جۆرە:**

- **بنەڕەتیی یان (ئاسایی):** ئەم جۆرە هۆکارێك نیە بۆ درێژ کردنەوەی، بەڵکو درێژ دەکرێتەوە تەنها بەهۆی بوونی یەکێك لە پیتەکانی "مەدد و لین" لەوشەکەدا، هۆی ناونانیشی بە بنەڕەتی یان ئاسایی ئەوەیە خاوەنی فیترەت و سروشتی تەواو

---

١ بڕوانە: الفتح المجید في علم التجوید / محمد ابراهیم المالکي / ٢٠ .

بەبێ زیادوو کەم بەو شێوە دەریدەبڕێت، لەوانەشە ئەوە هۆکاری باس نەکردنی (إبن الجزري)بێت بۆ ئەو جۆرە مەددە.

– مەددی لاوەکی (الفرعي): هۆی دروست بوونی یان هەمزەیە یان زەننەیە، وەکو دواتر باسیان دەکەین (إن شاءالله).

واتای گشتی:

جۆرەکانی مەدد بریتین لە مەددی (لازم) و (واجب) و (جائز) ئەم جۆری سێیەمیشە دروستە بەکورتی و بەدرێژی بخوێنرێتەوە[1].

٧٠. فَلاَزِمٌ إِنْ جَاءَ بَعْدَ حَرْفِ مَدْ     سَاكِنُ حَالَيْنِ وَبِالطُّولِ يُمَدْ

(إبن الجزری) لەم دێڕەدا یەکەمین جۆرەکانی مەدد ڕووندەکاتەوە، کە مەددی (لازم)ە.

(إِنْ جَاءَ بَعْدَ حَرْفِ مَدْ) واتە: ئەگەر لەدوای یەکێك لە پیتەکانی مەددەوە بێت.

(سَاكِنُ حَالَيْنِ) واتە: لەحاڵەتی ڕاوەستان و بەردەوام بووندا هەر (ساکن) بێت.

(وَبِالطُّولِ يُمَدْ) واتە: بەئەندازەی شەش جوڵە (حرکة).

دوو وتە هەیە سەبارەت بە ناونانی ئەم جۆرە مەددە بە مەددی (لازم):

یەکەم: چونکە هەموو خوێنەرانی قورئان (القراء) یەك دەنگن لەسەر پێویستی درێژکردنەوەی.

---

١ بەڵام کورتکردنەوە واتە: (القصر) لەڕێگەی ( الطيبة)ەوەیە، نەك لەڕێگەی (الشاطبية)ەوە، بۆیە ئەو کەسەش کەڕیوایەتی (حفص) لەڕێگەی (الشاطبية)ەوە دەخوێنێت بۆی نیە بە (قصر) مەددی نفصل بخوێنێت.

دووەم: چونکە ئەم جۆرە مەددە هەر دەمێنێتەوە لە حاڵەتی ڕاوەستان و بەر دەوام بووندا.

**مەددی (لازم) دەبێتە چوار بەشەوە:**

**أ- مەددی وشەیی قورس کراو (المد الكلمي المثقل) واتە:** زەننە کەوتبێتە پاش پیتی مەدد لە یەك وشەدا، زەننەکەش تێهەڵکێش کرابێت، وەکو: (الضَّالِّين - حاجّك - تأمروني).

**ب - مەددی وشەیی سوککراو (المد الكلمي المخفف)** وەکو: (ءَآلْئَنَ) لەهەردوو جێگەکەی سورەتی یونس دا.

**ج- مەددی پیتیی قورسکراو (المد الحرفي المثقل) واتە:** زەننەکە ئەسڵی بێت و تێهەڵکێشراو بێت وکەوتبێتە پاش پیتی مەدد، ئەم جۆرەش تەنها لەسەرەتای سورەتەکانەوە هەیە وەکو: (طسم) (الم).

**د- مەددی پیتی سووککراو (المد الحرفي المخفف) واتە:** زەننەی ئەسڵی تێهەڵکێش نەکراو لەپاش پیتی مەددەوە هاتبێت وەکو: (ق) (الـر).

## تێبینیەك سەبارەت بە دەر بڕینی پیتی (م) لەئایەتی (الم) کەلەسەرەتای سورەتی (آل عمران)ە

لەو حاڵەتە پێویستە بە ئەندازەی شەش جوڵە درێژ بکرێتەوە، ئەگەر لەگەڵ ئایەتی پاش خۆی پێکەوە خوێندمانەوە لەو حالەتە پیتی (م) لە وشەی (الم) سەر (فتحة)ی دەبێت و هەمزەی وشەی مەزنی (الله)یش دەرناکەوێت، چونکە ئەوە (همزة الوصل)ە لەکاتی بەر دەوام بوون دا لا دەبرێت، (فتحة)ی میمەکەش هەر تووش هاتوە بەهۆی یەککگرتنی دوو زەننەدار.

**لەکاتی بەردەوام بوون دا دوو حاڵەت دروستە:**

١- درێژ کردنەوەی پیتی (م) بە شەش جوڵە لەڕووی ئەوەوە کە لە بنچینەدا زەنندارە.

یان کورت کردنەوەی بۆ دوو جووڵە لەڕوی ئەوەی کە زەننەکەی نەماوە، هۆکاری مەددە (لازم)ەکە لا چووە.

**تێبینی:** مەددی (لازم)ی وشەییی کە لە پێشەوەی هەمزەی پرسیار هاتبێت و لەپاشی لامی ناساندن (لام التعريف) هاتبێت پێی دەوترێت: (مد الفرق) **واتە:** مەددی جیاکردنەوە، بۆنمونە جیاوازی نێوان وشەی (ءَآلْـَٔنَ)ی پرسیار کردنەکە دوو جار لە سورەتی (یونس) هاتووەو وشەی (الآنَ)ەی خەبەری تەنها مەددەکەیە.

**مەددی (واجب)ی لکاو (متصل):**

٧١ . وَوَاجِـبٌ إِنْ جَـاءَ قَبْلَ هَمْزَةِ        مُتَّصِلاً إِنْ جُـمِعَا بِكِلْمَةِ

**لێرەدا باسی جۆرێکی تری مەدمان بۆ دەکات کە بریتیە لە:**

(وَوَاجِـبٌ إِنْ جَاءَ قَبْلَ هَمْزَةِ) **واتە:** مەددی (واجب) ئەو مەددەیە کە پیتی مەدد لە پێش هەمزەوە هاتبێت لەناو یەك وشەدا وەکو دەر دەکەوێت لەوتەی (إبن الجزري) (مُتَّصِلاً إِنْ جُمِعَا بِكِلْمَةِ) **واتە:** لکاو بێت و لە نێو یەك وشە دا بێت **وەکو:** (السوء – قروء – سیئت – جيء – اولئك – ساء).

ئەم جۆرە مەددە هەمیشە لەیەك وشەدا دروست دەبێت، پێشەوایانی خوێندنەوەی قورئان هەموویان یەك بۆچونن لەسەر درێژ کردنەوەی، بەڵام جیاوازیان تێدایە سەبارەت بە ئەندازەی درێژ کردنەوەکەی.

**مەددی ڕێپێدراوی جیا (المد المنفصل الجائز):**

٧٢. وجائزٌ إذا أتى منفصلا      أوْ عرضَ السُّكونُ وَقْفاً مُسْجلا

(وجائز) **واتە: ئەم جۆرە مەددە ڕێپێدراو (جائز)ی پیێ دەوترێت.**

(إذا أتى منْفصلا) **واتە: ئەگەر پیتی مەدد لە هەمزەكە جیا بێت.**

**واتە: لە دوو وشەدا بن، پیتی مەدد لە كۆتای وشەی یەكەمدا بێت و هەمزەكە لەسەرەتای وشەی دووەم دا بێت، وەكو: (اني أنا – وما أرسلنا – قالوا آمنا) ئەمە بەشی یەكەمە لە بەشەكانی مەددی ڕێپیێ دراو (جائز)، بەشی دووەمیش لە حاڵەتێك دایە** (عرض السكون) **واتە: زەنەیەكی توشهاتوو دروست بێت.**

(وقفا) **واتە: بەهۆی ڕاوەستانەوە، وەكو: (العالمين – نستعين – بارزون – المؤمنون – الباد – البلاد).**

**لەم واتایانە باسمان كرد، دەر دەكەوێت مەددی (جائز) دوو جۆرە:**

**یەكەم: مەددی جیا (المنفصل) كە هۆكارەكەی هەمزەیە.**

**دووەم: مەددی توشهاتو بەهۆی زننە (المد العارض للسكون) ئەوەش بەهۆی زننە (سكون)ەوەیە، حوكمی ئەم دوو جۆرە مەددەش ئەوەیە.**

١. **كورت بكرێتەوە بۆ دوو جوڵە (٢ حركە).**
٢. **مام ناوەندی درێژ كرێتەوە چوار جوڵە (٤ حركە).**
٣. **درێژ كردنەوەی تەواو شەش جوڵە (٦ حركە).**

سەبارەت بە مەددی جیا (المنفصل) ئەوە بزانە كە جیابونەوەكەی دوو جۆرە:

١. جیابوونەوەیەكی ڕاستە قینە:

**واتە:** پیتی مەدد جێگیر بێت لە نوسینی قورئان و دەر بڕینی دا، **وەكو:** (بما انزل – امري الى الله).

٢. جیا بوونەوەیەكی حوكمی:

**واتە:** پیتی مەدد جێگیر بێت لە دەربڕیندا و، لابرێت لەنووسیندا (**واتە:** لەنووسینی قورئاندا) **وەكو:** (يأيها – يأدم – هؤلاء – إنه أنا) ئەمەش هەمان یاسای بەسەردا دەسەپێت.

سوود: لەوشەی (هؤلاء) دوو جۆر لە جۆرەكانی مەدد كۆبوەتەوە مەددی جیا لە(هؤ)مەددی لكاو لە (لاء) بۆیە ئاگادار بە)[1].

**ئاگاداری:** جۆرێكی تر هەیە لەمەدد مەددی گۆڕاو (بدل)ی پێ دەوترێت، **واتە:** یەكەم جار هەمزەدێت و پاش ئەوە پیتی مەدد دێت، **وەكو:** (آدم – إيمان – اوذوا– آزرُ– اوتوا) لەبنچینەشدا ئەم جۆرە وشانە دوو هەمزەیان هەیە، **واتە:** ئەو وشانە لەبنچینەدا بەم شێوەیە بوونە (أآدم – إئمان – أؤذوا – أآزر – أؤتوا) بەلأم بەهۆی قورسی دەربڕینی دوو هەمزە پێكەوە عەرەب هەر لەدێر زەمانەوە هەمزەی دووەمیانی گۆڕیوە لە چەشنی جووڵەی پێش خوی، **ئەم جۆرە مەددەش دەبێت بەدوو بەشەوە:**

١. مەددی گۆڕاوی بنەڕەتی (مد البدل الاصلي) كە كەمێك پێش ئێستا باسمان كرد.

---

١ بڕوانە: اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / ٧٧ – ٧٩.

٢. مەددی لێكچو بە گۆڕاو (المد الشبيه بالبدل) كە پیتی هەمزەی دوای پیتی مەد لە هەمزەوە نەگۆڕاوە (وەكو جۆری پێشوو) بەڵكو بنەڕەتیە لەخودی وشەدا، وەكو: (ﮈشاؤون — ليؤوس).

مامۆستای قورئان خوێنی پایە بەرز (محمود خليل الحصري)ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەكتێبی (احكام تلاوة القران الكريم) لاپەڕە/٢٢٨ فەرمویەتی:

جیاوازی هەیە لە پایەكانی درێژ كردنەوەی پیتە كانی مەددا، لەڕووی بەهێزی وڵاوازی بەپێی جیاوازی هۆكارەكانیان، جا ئەگەر هۆكاری درێژ كردنەوەكە بە هێز بوو، درێژ كردنەوەكە بەهێز دەبێت، ئەگەریش لاواز بوو لاواز دەبێت.

لە هەموویان بەهێزتر مەددی (لازم)ە، چونكە لەڕاوەستان و بەردەوام بووندا هەر جێگیرە، هەروەها هەموو پێشەوایانیش یەك دەنگن لەسەر درێژ كردنەوەی بەیەك ئەندازە كە شەش جوڵەیە، پاشان هۆكاری مەددی لكاو كە هەمزەیە، ئەویش بەهۆی جێگیربوونی لە ڕاوەستان و بەردەوام بووندا و، یەك دەنگی زانایان لەسەر درێژ كردنەوەی بەئەندازەیەكی جیاواز.

پاش ئەو دوو جۆرە هۆكاری مەددی توش هاتوو بەزەننە دێت، كە (سكون)ە، دكتۆر (أيمن سويد) دەڵێت:

ئەگەر زیاتر لە هۆكارێك كۆبوویەوە بۆ یەك پیتی مەدد، هۆكارە لاوازەكە لا دەبرێت و، بەهێزەكە كاری پێ دەكرێت، وەكو: لابردنی (بدل) وكار پێكردنی (لازم)و (متصل) یان لابردنی (بدل) و كارپێكردنی (عارض) و (المتصل)، ئەگەر مەددی (متصل) و (عارض) كۆبێتەوە لەوشەیەكدا وەكو: (السماء)بە هۆكارە بەهێزەكە كار دەكرێت كە (متصل)ە.

دکتۆر ئەیمن دەڵێت:

هەموو ئەم باسەش لەلایەن (إبراهیم شحاتة السمنودي) مامۆستامەوە پوختە کراوەتەوە بەوەی کە فەرموویەتی:

| | |
|---|---|
| اقوی المدود لازم فما اتصل | فعارض فذو انفصال فبدل |
| وسببـا مـد اذا مـا و جـدا | فـان اقـوى السببين انفـرادا |

٥٥٥

# بابەتی ڕاوەستان و دەست پێكردن
## (الوقف والإبتداء)

٧٣. وَبَعْدَ تَجْوِيدِكَ لِلْحُرُوفِ لاَبُدَّ مِنْ مَعْرِفَةِ الْوُقُوفِ

٧٤. والابتداء وهي تقسمْ إذَنْ ثَلاَثَةٌ تَامٌ وَكَافٍ وَحَسَنْ

**پێناسەی (الوقف والابتداء):**

(الوقف): لە زمانەوانیدا واتە: ڕاوەستان، یان وەكو: (إبن منظور) دەڵێت: پێچەوانەی دانیشتن)[1].

لە زاراوەدا واتە: دەنگ بڕین و كۆتایی هێنان بە خوێندنەوەی وشەیەكی قورئانی پیرۆز لەگەڵ هەناسەدان و هەبوونی نیاز بۆ تەواو كردنی خوێندنەكە جارێكی تر، ڕاوەستانیشی پێ ناوترێت ئەگەر هەناسە نەدات، وەستانیش لە كۆتایی ئایەتەكاندا دەبێت، یان لە كۆتایی وشەیەكدا، هەرگیز لە ناوەڕاستی وشەشدا ئەنجام نادرێت[2].

**(الابتداء):**

لە زمانەوانیدا: دەستپێكردن.

لە زاراوەدا: دەستپێكردنی قورئان خوێندن پاش بڕین یان ڕاوەستان لە خوێندنەوە، بە ئارەزووی خوێنەرەكە[3].

---

١ بڕوانە: (لسان العرب) ماددەی (و، ق، ف)، هەروەها بۆ هەموو واتا زمانەوانییەكانی بڕوانە: علم الوقف والابتداء في القران واللغة العربية / د. عبدالرزاق أحمد الحربي /١٣ – ١٤ .

٢ بڕوانە: اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / ٨٣ .

٣ الجامع / ٣٤٤ .

یان: چۆنییەتی دەستپێکردنی دەربڕینی وشەی قورئان لە حاڵەتی گواستنەوە لە بێ دەنگی یەوە بۆ قسەکردن[١].

**گرنگی فێربوونی ئەم زانستە:**

دەگێڕنەوە کە (عبدالله بن عمر) ڕەزای خوای لێبێت **فەرموویەتی:** (سەردەمێکمان لە تەمەنمان بەسەربرد، ئیمان و باوەڕمان بەسەردا دادەبەزی لە پێش دابەزینی قورئان، سورەتێك دادەبەزییە سەر پێغەمبەری سەروەر، ئێمەش فێری حەڵاڵ و حەرام دەبووین و، فێردەبووین لە چی جێگەیەکدا پێویستە ڕاوەستین، وەکو چۆن ئێوە ئەمڕۆ فێری قورئان خوێندن دەبن، بەڵام ئێمە ئەمڕۆ کەسانێکمان بینی قورئانی لەپێش ئیماندا دەدرێتێ سەرتاسەری قورئان دەخوێنێتەوە بەڵام نازانێ کامە فەرمانە و کامە هەڕەشەیە، یان لەکام ئایەتدا پێویستە ڕاوەستێ)[٢].

ئەم شوێنەوارەش کە پێشەوا (البیهقي) دەیگێڕێتەوە، وەکو پێشەوا (السیوطي) **فەرموویەتی:** (بەڵگەیە لەسەر یەکدەنگی هاوەڵان لەسەر گرنگی ئەم بابەتە).

هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی هاوەڵە بەڕێزەکان فێری ڕاوەستان دەبوون لە قورئاندا، هاوەڵان و تابیعییەکانیش، هەروەها پێشەوا قورئان خوێنەکانیش، لەسەر هەمووشیانەوە پێشەوایان (نافع و ابو عمرو و یعقوب و عاصم) یەکدەنگن لەسەر گرنگی ئەم زانستە بەڕادەیەك کە زۆرێك لە زانایان مەرجیان داناوە کە ئیجازە نەدرێتە هیچ قوتابییەك تاوەکو شارەزانەبێت لە ڕاوەستان لە قورئاندا.

(وَبَعْدَ تَجْوِيْدِكَ لِلْحُرُوفِ) **واتە:** پاش شارەزابوونت لە ڕاست و جوان خوێندنەوەی پیتەکان لە ڕێگەی ئەو زانیارییانەی کە وەرتگرت دەربارەیان.

---

١ اللمعة /٨٣ .

٢ بڕوانە: الاتقان في علوم القران / السیوطي/١/٢٣٦.

(لأَبـدَّ) **واتە:** پێویستە ئەوان بڕازێنیتەوە بە:

(مَعْرِفَةِ الْوُقُـوفِ) شارەزابوون لە زانستی ڕاوەستان لە قورئاندا هەروەها بە:

(الإبتداء) بە زانستی دەستپێکردنیش، چونکە ئەویش مەسەلەیەکی گرنگە. بەهەمان شێوە ئەوەش بزانە کە ڕاوەستان لە قورئاندا دەبێتە سێ بەشەوە:

١- ڕاوەستانی تەواو (تام).

٢- ڕاوەستانی کیفایەت (کافي).

٣- ڕاوەستانی جوان (حسن).

پاشان پێشەوا (إبن الجزري) دەست دەکات بە شیکردنەوەی ئەم مەسەلە، دەفەرمووێت:

٧٥. وَهْـيَ لِمَا تَمَّ فَـإِنْ لَمْ يُوجَدِ     تَعَلُّقٌ أَوْ كَـانَ مَعْنَىً فَابْتَدِي

٧٦. فَالتَّامُ فَالْكَافِي وَلَفْظًا فَامْنَعَنْ     إِلاَّ رُؤُوسَ الآيِ جَـوِّزْ فَالْحَسَنْ

(وَهْـيَ) **واتە:** ئەو جۆرە ڕاوەستانانەی باسمان کرد بۆ ئەوە دەبێت کە:

(لِمَا تَمَّ) واتاکەی تەواو بێت.

**واتە:** ئەو ڕاوەستانە بۆ ئەو جێگایانە لە قورئان کە واتایەکی تەواو بگەیەنێت. تاکو ئێرە قسە دەربارەی ڕاوەستان تەواو بوو، ئینجا دەستی کردە باسکردنی دەستپێکردنەوەی پاش ڕاوەستان و، فەرمووی:

(فَـإِنْ لَـمْ يُوجَـدِ) **واتە:** ئەو جێگەی كە لەسەری ڕادەوەستێت (تَعَلُّقٌ) پەیوەندی نەبوو بە پاشی خۆیەوە.

(أَوْ كَـانَ) یان هەیبوو، بەڵام پەیوەندییەكی واتایی بوو، نەك وشەیی[١].

(فَابْـتَدِي) **واتە:** بۆت هەیە لەكاتی گەڕانەوەت بۆ خوێندنی قورئان لەو جێگەوە دەست پێبكەیت كە لە پێشەوە ڕاوەستای. تاكو ئێستا باسی دووجۆر ڕاوەستانی كردووە (تَامْ) پەیوەندی نییە بەدوای خۆیەوە (الْكَافِي) كە پەیوەندی هەیە بەدوای خۆیەوە.

(وَلَفْظًـا) **واتە:** ئەگەر ئەو پەیوەندییە لە وشەدا بوو (فَامْنَعَنْ) ئەو جۆرە دەستپێكردنە قەدەغە بكە، **واتە:** دەست پێمەكە لەو جێگەی كە لەپێشەوەی ڕاوەستاو بووی، بەڵكو لە هەرجێگەیەكەوە دەست پێبكە لە ئایەتەكە كە دروست بێت دەستی پێبكەیت.

(إِلَّا) تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت ئەویش:

(رُؤُوسَ الآيِ) **واتە:** سەری ئایەتەكان، دروستە ڕاوەستی لەسەریان و، لە سەرەتای ئایەتەكەی پاش خۆیەوە دەست پێبكەیت. با باسەكەشی پێكەوە لكاو بێت لە ڕووی وشەوە، ئینجا ڕوونی كردەوە كە ئەم جۆرە پێی دەوترێت: (الْحَسَنْ).

---

١ واتە: قسەكە پێكەوە لكاوە لە ڕووی واتاوە، بەڵام جیایە لە ڕووی وشەوە، وەكو ڕاوەستان لەسەر {لَقَدْ جِئْتَ شَيْئاً إِمْراً} الكهف٧١، ئەمە كۆتاییی ئایەتەكەیە و، دابڕاوە لە پاشی خۆی لە ڕووی وشەوە، بەڵام پێوەی لكاوە لە ڕووی واتاوە .

**واتای گشتی:**

**ئەو ڕاوەستانانەی کە باس کران بۆ حاڵەتێکە واتاکەی تەواو بێت، جا ئەگەر ئەو جێگەی لەسەری ڕاوەستای هیچ پەیوەندییەکی بەدوای خۆیەوە نەما، لەو حاڵەتە دەتوانی لەوشەی پاش ڕاوەستانەکەتەوە دەست پێبکەیت، یان ئەگەر پەیوەندی هەبوو لە ڕووی واتاوە، نەك لە ڕووی وشەو ئیعرابەوە ئەوەش هەر دەتوانی لە پاش ئەو جێگەیەی ڕاوەستای لەسەری دەست پێبکەیت.**

**ڕاوەستانی تەواویش ئەوەیە کە هیچ پەیوەندی بە پێشی خۆیەوە نەبێت ئەمەش زیاتر لەسەر ئایەتەکاندا ڕوودەدات، یان لە کۆتایی سەرگوزشتەکان، وەکو: (مالك يوم الدين) و، دەست پێکردن بە (اياك نعبدواياك نستعين).**

**ڕاوەستانی (کافی)یش ئەوەیە لە جێگەیەك ڕاوەستیت واتاکەی تەواو بووبێت بەڵام لە ڕووی واتاوە پەیوەندی هەر مابێت بەدوای خۆیەوە وەکو: (ومما رزقناهم) (وبالاخرة هم يوقنون) بەڵام ئەگەر لە ڕووی وشەو ئیعرابەوە پەیوەندی مابوو لەو جێگەوە دەست پێ مەکە، ئەگەر سەر ئایەتەکان بێت ئەوە دروستەوە و ڕاوەستانی (حسن)ی پێ دەوترێت.**

٧٧ . وغَيْرُ مَا تَمَّ قَبِيحٌ وَلَهُ أُلْوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيُبْدَا قَبْلَهُ

**واتە: ئەوە بزانە هەر ڕاوەستانێك جگە لەم ڕاوەستانە (التام – الكافي– الحسن) ڕاوەستانی ناشیرینی پێدەوترێت، دروست نییە ئەو جۆرە ڕاوەستانە مەگەر لە ڕووی ناچارییەوە، دروستیش نییە لە پاش ئەو جێگەی ڕاوەستانەوە دەست پێبکرێت، بەڵکو پێویستە بگەڕێتە دواوە لە پێش ئەو جێگەوە دەست پێبکات کە بەناچاری لەسەری ڕاوەستاوە.**

**نموونەی ڕاوەستانی ناشیرین** (الوقف القبيح) **لە دوو جۆر ڕاوەستاندایە:**

**جۆری یەکەم:** ڕاوەستان لەسەر وتەیەك کەواتاکەی ڕوون نییە بە هۆی پەیوەندی زۆری بە پێش خۆیەوە وەکو ڕاوەستان لەسەر وشەی (بسم) لە (بسم الله) یان ڕاوەستان لە سەر (الحمد) لە (الحمد لله)[1].

**جۆری دووەم:** ڕاوەستان لە جێگەیەك کە گومان دروست دەکات دەربارەی واتایەك کە خوای گەورە ئەوەی نەویستووە **وەکو:** (ان الله لا يستحيي) یان (ما من اله) یان (لاتقربوا الصلاة) و، ڕاوەستانی لەم جۆرە شوێنانە ناشرین ترە.

٧٨. وَلَيْسَ فِي الْقُرْآنِ مِنْ وَقْفٍ وَجَبْ وَلَا حَرَامٌ غَيْرَ مَا لَهُ سَبَبْ

**واتە:** لە قورئاندا جێگەیەك نیە ئەگەر خوێنەر لەسەری ڕانەوەستێت گوناهبارببێت، یان ڕاوەستان لەسەری قەدەغەبێت، مەگەر هۆکارێکی هەبێت، مەگەر ئەوەی کەسێك بەئەنقەست لەسەر (ما من إله) یان (إني كفرت) ڕاوەستێت[2].

۞۞۞

---

[1] وەکو ڕاوەستان لەسەر (حرف جر) و جیاکردنەوەی لە (إسم مجرور) و، ڕاوەستان لەسەر (مضاف) و جیاکردنەوەی لە (مضاف إليه)، هەروەها ، ڕاوەستان لەسەر (مبتدأ) و جیاکردنەوەی لە (خبر). ((م. دلێر گەرمیانی))

[2] بڕوانە: الدرر البهية ٧١-٧٣، اللمعة البدرية / ٨٣-٨٥، المنح الفكرية ٢٢٠-٢٤٠ .

## پوختەی جۆرەکانی ڕاوەستان

**ڕاوەستان لە قورئاندا دەبێتە چوار بەشەوە:**

**بەشی یەکەم:** ڕاوەستانی تاقیکردنەوە (الوقف الإختباري). **واتە:** خوێنەر لەسەر وشەیەك ڕاوەستێت خۆی جێگەی ڕاوەستان نەبێت، بەمەبەستی تاقیکردنەوە یان فێرکردن، **بۆنمونە:** لەسەر وشەی (الأيدي) ڕادەوەستێت لە ئایەتی {وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ أُولِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ}ص٤٥، بەمەبەستی ئەوەی کە بەرانبەرەکەی بزانێت ئەو وشەیە لێرەدا بە جێگیرکردنی پیتی (ي) دەنووسرێت و دەخوێنرێتەوە، بەپێچەوانەی وشەی (الأيد) لەئایەتی {اصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ إِنَّهُ أَوَّابٌ}ص١٧، لێرە بەپیتی (ي) نەنووسراوە بەبێ ئەو پیتەش دەخوێنرێتەوە.

**- بۆچی ناونراوە ڕاوەستانی تاقیکردنەوە (الإختباري)؟**

چونکە ڕوودانی وەکو وەڵامێکە بۆ پرسیارێك یان بۆ فێرکردنی قوتابیە.

**حوکمی:** دروستە لەسەر هەر وشەیەك ڕاوەستێت، بەمەرجێك بۆ دەستپێکردن خوێنەر بگەڕێتەوە و، لەجێگەیەکەوە دەست پێبکات واتاکەی ڕێك بێت.

**بەشی دووەم:** ڕاوەستانی ناچاری (الوقف الإضطراري).

**واتە:** ڕاوەستانی خوێنەری قورئان بەهۆی پێویستیەکەوە وەکو: پژمین و، هەناسەکورتی و، گریان، یان هەر هۆکارێکی تر.

- هۆکاری ناونانی بە ناچاری ئەوەیە کەخوێنەر بەویستی خۆی ڕاناوەستێت بەڵکو لەبەر هۆکارێك ناچار دەبێت.

**حوكمی:** دروستە خوێنەر لەسەر هەرپیتێك ڕاوەستێت، تاكو هۆكاری ڕاوەستانەكەی تەواو دەبێت و، ئینجا بگەڕێتەوە و، بەشێوەیەك دەست پێبكات واتاكەی ڕێكوپێك بێت.

**بەشی سێیەم:** ڕاوەستانی چاوەڕوانی (الوقف الإنتظاري).

**واتە:** وەستان لەسەر وشەیەكی قورئان بەمەبەستی تەواو كردنی شێوازەكانی خوێندنەوەی ئەو ئایەتە لەڕووی قیرائاتەوە لەڕووی كۆكردنەوەی قیرائەتەكان.

- هۆكاری ناونانی بە (انتظاري)، چاوەڕوانكردنی مامۆستایە لە قوتابی كە هەڵسێ بەخوێندنەوەی ئایەتەكە بە هەموو ڕووەكانی، وەكو ڕاوەستان لەسەر ئایەتی {أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ}البقرة٦ و، خوێندنەوەی بەپێی خوێندنی پێشەوایانی قورئان خوێندن، **وەكو:** (نافع) و (إبن كثير) و (ابو عمرو) و (ابن عامر) و (عاصم)و (حمزە).

**حوكمی:** دروستە ڕاوەستان بۆ ئەم مەبەستە لەسەر هەر وشەیەك، تاكو تەواو كردنی شێوازەكانی خوێندنەوە، با واتاكەشی تەواو نەبێت، بەمەرجێك لەپاش تەواو بوون بەشێوەیەك دەست پێ بكاتەوە واتاكەی ڕاست و دروست بێت.

**بەشی چوارەم:** ڕاوەستانی ویستن(الوقف الإختياري).

**واتە:** خوێنەر لەسەر وشەیەكی قورئان ڕاوەستێت بەویست و ئارەزووی خۆی، بێ ئەوەی هیچ هۆكارێك ناچاری بكات بۆ ڕاوەستان.

- هۆكاری ناونانی بەم ناوە چونكە خوێنەر بەتەواوی بە ویست و ئارەزووی خۆی ڕاوەستان هەڵدەبژێرێت لەو جێگەیەدا.

**حوكمی:** ڕاوەستان دروستە مەگەر لە بارێكدا بێت واتایەكی نەویستراو بگەیەنێ، هەروەها دەكرێت لە وشەی پاش ئەو وشەی كە لە سەری ڕاوەستا دەست پێ بكات ئەگەر گونجاو بێت، ئەگەر نا لەپێشترەوە دەست پێ دەكات.

**بەشەکانی ئەم جۆرە ڕاوەستانە:**

لەڕاستیدا زانایان دەربارەی بەشەکانی ئەم جۆرە ڕاوەستانە جیاوازییان لەنێوانداپە، وەکو مامۆستا (محمد علي الضباع) باسی دەکات لە کتێبی (الإضاءة في أصول القراءة) لاپەڕە ٤٨–٥٣[١]، بەڵام ئەوەی کە زانا گەورەکان لەسەری پێکهاتوون و هەڵیان بژاردووە (٤) بەشە، وەکو: (أبو عمرو الداني) و (إبن الجزري) بڕیاریان داوە:

**یەکەم:** ڕاوەستانی تەواو (الوقف التام).

**پێناسەی:** واتە ڕاوەستان لەسەر قسەیەکی تەواو لەخۆیدا، کەپەیوەندی بەپاشی خۆیەوە نەمابێت، لەڕووی وشەو ئیعرابەوە، نەك لەڕووی واتاوە، ئەمەش دەبێتە دوو جۆرەوە:

**جۆری یەکەم:** پێویستە لەسەری ڕاوەستیت و لەپاش خۆیەوە دەست پێ بکەیت، چونکە ئەگەر بدرێتە دەم برگەی پێش خۆیەوە، گومان دروست دەکات کەواتایەکی نەویستراو ببەخشێت، هەربۆیە هەندێك بە ڕاوەستانی (لازم) و هەندێك بەڕاوەستانی (واجب) ناوی دەبەن، ئەم جۆرە ڕاوەستانە (التام المقید) واتە تەواوی مەرج بۆدانراوی پێدەوترێت.

**نمونە:** {فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ}یس٧٦، ڕاوەستان لەسەر وشەی (قَوْلُهُمْ) پێویستە چونکە گەر بدرێتە دەم وشەی پاش خۆیەوە {إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ}یس٧٦، گومان دروست دەکات ئەم دوایین برگەیە وتەی بێباوەڕان بێت، خۆیشی وانیە، یان ڕاوەستان لەسەر وشەی (يَسْمَعُون) لەئایەتی {إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ}الأنعام٣٦ پێویستە، چونکە گەر بدرێت بەدەم برگەی پاش خۆیەوە گومان دروست دەکات کە مردوەکانیش وەکو زیندووەکان بەشدارن لە گوێڕایەڵی.

---

١ بڕوانە: الإضاءة في أصول القراءة / ٥١، بە وەرگرتن لە المرید في علم التجوید / ٢٠٦ – ٢٠٨.

**حوکمی:** پێویستە لەسەری ڕاوەستیت و، لەپاش خۆیەوە دەست پێبکەیت، هەربۆیە ناونراوە بە ڕاوەستانی (اللازم).

**نیشانەکەی:** میمێکی ئاسۆیی بۆ دادەنرێت بەم شێوەیە(مـ).

**جۆری دووەم:** ئەوەیە جوانترە لەسەری ڕاوەستیت و لەپاش خۆیەوە دەست پێبکەیت، بەواتایەکی تر، دەتوانیت بەدەم برگەی دوای خۆیەوە بیخوێنیتەوە مادام واتاکەی ناگۆڕێت، هەندێکیش لەزانایان بەم ڕاوەستانە دەڵێن: تەواوی ڕەها(التام المطلق).

**هۆی ناونانی:** چونکە وتەکە لەو شوێنەدا تەواو دەبێت و،پێویستی نابێت بە پاش خۆی، نە لەڕووی وشەو، نە لەڕووی واتا، زۆرجاریش ئەم جۆرە ڕاوەستانە لە کۆتایی ئایەتەکان و لە کۆتایی بەسەرهاتەکاندا دروست دەبێت، یان لەکۆتایی حوکمێکی دیاریکراو، لەوانەشە لە ناوەڕاستی ئایەت یان سەرەتای بێت.

**نمونە:** ئەم جۆرە ڕاوەستانە نمونەکانی بەچوار شێواز دێن:

**شێوازی یەکەم:** لەسەر ئایەتەکان، وەکو{وَأُوْلَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ }البقرة٥، کە ئەوە کۆتایی ئەو ئایەتانەیە پەیوەندیدارن بەحاڵی ئیمانداارانەوە، لەپاش ئەوەش باسی بارودۆخی بێ باوەڕان دەکات.

**شێوازی دووەم:** لەپێش کۆتایی ئایەتەکە دەبێت، وەکو فەرموودەی خوای گەورە {الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ}الأحزاب٣٩، ئەمەش کۆتایی ستایش کردنی پێغەمبەرانە، لە پاش ئەوە دەفەرموێت {وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيباً} .

**شێوازی سێیەم:** لە ناوەڕاستی ئایەتە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: {لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي}الفرقان٢٩، ئەمە کۆتایی قسەی کەسی ستەمکارە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: {وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولاً ﴿٢٩﴾}الفرقان٢٩.

**شێوازی چوارەم:** لەسەرەتای ئایەتەکان، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ}الصافات١٣٧–١٣٨، ئەمە کۆتایی واتاکەیە ئەگەر چی (مُّصْبِحِينَ) کۆتایی ئایەتەکەیە.

**حوکمی:** جوانترە لەسەری ڕاوەستیت و، لەپاش خۆیەوە دەست پێبکەیت، ڕاوەستانیش لەسەری لەپێشترە تاکو بەردەوام بوون.

**نیشانەکانی:** دانانی وشەی (قلى) لەسەر پیتەکە کە وتمان جوانترە لەسەری ڕاوەستیت.

**سوود:** وشەی (قلى) کورتکراوەی ئەم بڕگەیە (الوقف اولى من الوصل) واتە: ڕاوەستان پێشترە لە بەردەوام بوون[1].

**بەشی دووەم:** ڕاوەستانی (الكافي).

**پێناسەکەی:** واتە ڕاوەستان لەسەر واتایەکی تەواو لە خۆیدا، بەڵام پەیوەندی ماوە بە واتای پاش خۆیەوە نەك لەڕووی وشەو ئیعرابەوە.

**نمونە:** ڕاوەستان لەسەر ئایەتی {أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾}البقرة٦ و، دەستپێکردن بەئایەتی {خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ}البقرة٧، کۆتایی ئایەتەکە واتایەکی تەواوە هیچ پەیوەندیەکی وشەیی یان ئیعرابی بەپاش خۆیەوە نەماوە، بەڵام لەڕووی واتاوە پەیوەندیان پێکەوە ماوە، چونکە هەردوو ئایەتەکە باس لە بارودۆخی بێ باوەڕان دەکەن.

**حوکمی:** جوانترە لەسەری ڕاوەستیت و لەپاش خۆیەوە دەست پێ بکەیت، وەکو ڕاوەستانی تەواو، بەڵام ڕاوەستان لەسەر (وقف تام) جوانترە.

---

١ بڕوانە: نهاية القول المفيد في علم التجويد/ ١٥٤–١٥٥ بەوەرگرتن لە کتێبی/ غاية المريد في علم التجويد / ٢٠٩–٢١٠.

**هۆی ناونانی:** چونکە پێویستیت نابێت بە واتای پاش خۆی، ئەمیش زۆرترین جۆری ڕاوەستانە لەقورئاندا هاتبێت[١].

**نیشانەی:** پیتی (ع) لەسەر ئەو وشە دادەنرێت وەکو {لاَ تَقْتُلُواْ الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ}المائدة٩٥.

بەپێی وتەی (ابن الجزري) لەکتێبی (النشر في القراءات العشر ج١/٢٢٠) ڕاوەستانی کافی هەمووی وەکو یەك نین، بەڵکو هەندێکیان لە هەندێکیان شیاو ترن، وەکو:

{فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ }البقرة١٠، ئەمە (کافي)ە.

{فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً} البقرة١٠، ئەمە (کافي) ترە.

{بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ} البقرة١٠، لەهەردووکیان (کافي) ترە.

**بەشی سێیەم:** ڕاوەستانی جوان(الوقف الحسن).

**پێناسەکەی:** ڕاوەستانە لەسەر واتایەکی تەواو لەخۆیدا، بەڵام پەیوەندیدارە بە پاش خۆیەوە لەڕووی وشەو واتاوە.

**هۆی ناونانی:** چونکە سوودی ئەوەی هەیە ڕاوەستان لەسەری کارێکی جوان و گونجاوە.

**جۆرەکانی:**

**یەکەم:** لەناو ئایەتەکەدا بێت، وەکو ڕاوەستان لەسەر فەرموودەی خوای گەورە: {بِسْمِ اللّهِ}الفاتحة١، یان لەسەر {الْحَمْدُ للّهِ}الفاتحة٢، ئەوە واتایەکی تەواوە، بەڵام لەهەردوو ڕووەکەوە پەیوەندی بەپاش خۆیەوە ماوە.

---

١ بڕوانە: العمید في علم التجوید/ ١٨٥ بەوەرگرتن لە کتێبی/ غایة المرید في علم التجوید ٢١٠-٢١١.

حوکمی: دەگونجێت لەسەر ئەو وشە ڕاوەستیت و، ناگونجێت لەپاش خۆیەوە خوێندنەوە دەست پێبکەیت، چونکە پەیوەندی نێوانیان بەهێزە.

دووەم: سەری ئایەت بێت، ئەوەش دوو شێوازی هەیە:

یەکەم: ڕاوەستان لەسەر ئایەتەکە هیچ گومانی واتای نەویستراو دروست نەکات، وەکو ڕاوەستان لەسەر {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} یان لەسەر {لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ}البقرة١٨٩، یان لەسەر {يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ}المزمل١ ئەمەش بەپێی شارەزایانی ئەم زانستە وەکو: (السجاوندي) و، دانەری کتێبی (الخلاصة) و، کەسانی تر: جوانترە لەسەری ڕاوەستیت و، باش نیە لەپاش خۆیەوە دەست پێبکەیت[1]...

دووەم: ئەوەیە ڕاوەستان لەسەر ئایەتەکە گومانی واتایەکی نەخوازراو دروست بکات، وەکو ڕاوەستان لەسەر {فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ}الماعون٤، ئەمەش بەپێی بۆچوونی(ابن الجزري) و، زۆرێك لەزانایانی تر، دروست نیە لەسەری ڕاوەستیت، بەڵکو پێویستە لەگەڵ پاشی خۆیدا پێکەوە بخوێنرێتەوە، چونکە نوێژگەران ناوێکی ستایشکراوە، بۆیە نەگونجاوە گوێگر واتێ بگات وەیل بۆ ئەوانە، ئەوانەی لەسەر ئەم ڕێڕەوەن پێیان وایە ڕاوەستان لەسەر ئەم ئایەتە ڕاوەستانێکی ناشیرینە (وقف قبيح).

تێبینی: لەوانەیە ڕاوەستان جوان بێت، بەڵام دەستپێکردن لەپاش خۆیەوە ناشیرین بێت وەکو: {يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ}الممتحنة١، ڕاوەستان جوانە لەسەری، بەڵام دەست پێکردن لەدوای ئەوەوە ناشرینە {وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ}، چونکە ئەوە واتای هۆشداری لە ئیمان هێنان بەخوا دەگەیەنێ.

---

١ بڕوانە: نهاية القول المفيد في علم التجويد/ ١٦١، بەوەرگرتن لە کتێبی / غاية المريد في علم التجويد /٢١٢.

**بەشی چوارەم: ڕاوەستانی ناشیرین (القبيح).**

**پێناسەی:** ڕاوەستان لەسەر واتایەك تەواو نەبوبێت خۆی لەخۆیداو،واتایەكی ڕاستیشی نەگەیاندبێت، بە هۆی توندی پەیوەندیەكەی لەگەڵ پاش خۆیدا.

**هۆی ناونانی:** چونكە ڕاوەستان لەو جێگەیەدا واتا ناگەیەنێت، بۆیە خوێنەر بۆی نیە بەئەنقەست لەسەری ڕاوەستێت مەگەر بۆ پێویستیەكی ناچاری.

**ڕاوەستانی ناشیرین دوو جۆرن:**

**جۆری یەكەم:** ڕاوەستان لەسەر بڕگەیەك كە واتا نەبەخشێت، وەك: {بِسْمِ} لە {بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ}، ڕاوەستان لەو جێگەیەدا ناشرینە چونكە نازانرێت بەناوی كێ.

**جۆری دووەم:** ڕاوەستان لەسەر وشەیەك گومانی واتایی دروست بكات كە خوای گەورە ئەوەی نەویستبێت، وەكو ڕاوەستان لەسەر ئایەتی {إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي}البقرة٢٦ یان {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ} الإسراء٥٤، یان {لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ}النساء٤٣، ئەم جۆرە ڕاوەستانانە زۆر ناشرینە، ئەگەریش بە ئارەزووی خۆی ڕاوەستێت و، مەبەستی ئەوە بێت، ئەو كارە لە بێباوەڕیەوە سەر دەر دەكات پەنابەخوا، بەڵام ئەگەر بەناچاری ڕاوەستا با بگەڕێتەوە و، پێكەوە ئایەتەكان بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی واتاكان ڕوون ببنەوە.

تاكو ئێرە باسی جۆرەكانی ڕاوەستان لە قورئان تەواو بوو[١]، ئێستاش باسی دەستپێكردن (الإبتداء) دەكەین.

**پێناسەی (الإبتداء):**

لەزمانەوانیدا **واتە:** دەستپێكردن.

---

١ بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد / عطية قابل نصر/٢١٠-٢١٤.

لەزاراوەدا واتە: دەستپێکردنی قورئان خوێندن، ئیتر ئایا لەپاش بڕینی خوێندن بێت و جارێکی تر گەڕابێتەوە، یان لەپاش ڕاوەستان بێت. بەڵام ئەگەر لەپاش بڕینی خوێندن بێت پێویستە ڕەچاوی حوکمەکانی (إستعاذة) و (بسملة) بکات لەکاتی دەستپێکردندا، بەڵام ئەگەر لەپاش ڕاوەستان بێت پێویست بەوە ناکات چونکە ڕاوەستانەکە بۆ پشوو دان و هەناسەدان بووە.

لە کتێبی (النشر في القراءات العشر) پیشەوا (إبن الجزري) دەفەرموێت:

دەست پێکردن هەمیشە بە ویست و ئارەزووە، بەپێچەوانەی ڕاوەستانەوە کە لەوانەیە بەناچاری بێت، بۆیە دروست نیە دەستپێکردن بە واتایەکی تەواو و قسەیەکی سەربەخۆوە نەبێت، دەستپێکردنیش دوو جۆرە:

١. دەستپێکردنی جوان.

٢. دەستپێکردنی ناشیرین.

یەکەم: دەکرێت لەهەر ئایەتێکەوە کە واتایەکی ڕوون و ئاشکرای هەبێت دەست بکەیت بە قورئان خوێندن، نمونەی ئەم جۆرەش زۆرە.

دووەم: دەستپێکردن بە قسەیەك واتاکە بشێوێنێت، یان بیگۆڕێت، ئەمەش دابەش دەبن بۆ چەند جۆرێك، نمونە:

دەست پێکردن بە {أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ}المسد١، دەستپێکردنێکی ناشیرینە چونکە واتاکە دادەبڕێت، بەڵام دەستپێکردن بە (يد الله مغلولة) ناشرین ترە، یان دەستپێکردن بە {عُزَيْرٌ إبن اللهِ}التوبة٣٠، یان {وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ}الممتحنة١، یان {لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي}يس٢٢، زۆرتر ناشیرینە، بۆیە پێویستە خوێنەر خۆی لەو جۆرە

دەستپێكردنانە بپارێزێت.بەم شێوەیەش باسەكانی ئەم بابەتەمان تەواو بوو، جگەلە دوو پێناسەی گرنگ كە بریتین لە: (السكت) و (القطع).

**پێناسەی بێدەنگی (السكت):**

لەزمانەوانیدا واتە: لێكترازانی نێوان دوو ئاواز بەبێ هەناسەدان.

لەزاراوەدا واتە: بێدەنگی بۆ ماوەیەك كەمتر لەماوەی ڕاوەستان (وقف) بەبێ هەناسەدان بەمەبەستی بەردەوام بوون لە خوێندنەوە.

**تێبینیەكی گرنگ:**

مامۆستا (محمود خلیل الحصري) لە كتێبی (أحكام التلاوة القرآن) لاپەڕە ٢٦١، دەگێڕێتەوە كە (إبن الجزري) فەرموویەتی: بێدەنگی تەنها پەیوەستە بە (سماع)ەوە، واتە: بەپێی ڕیواتە لە پێغەمبەر (ﷺ) یان لە هاوەڵانی كە پێمان گەیشتبێت، بۆیە بێدەنگی دروست نیە لەشوێنێكدا نەبێت كە ڕیوایەتی ڕاستی لەسەر هاتبێت[١].

**جێگەكانی بێدەنگی لە قورئاندا:**

**یەكەم:** لەسەر وشەی (عِوَجَاً) لە ئایەتی {وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا ۞ قَيِّماً}الكهف١، هۆكاری بێدەنگیش لێرەدا ڕوونكردنەوەی واتاكەیە، بۆئەوەی كەس گومانی بۆ دروست نەبێت (قَيِّماً) واتە: ڕاست، وەسف بێت بۆ (عِوَجَا) واتە: لار، بەڵكو (قَيِّماً) ستایشە بۆ قورئان.

**دووەم:** لەسەر وشەی (مرقدنا) لەئایەتی{قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا}يس٥٢، هۆكاری بێدەنگی لێرەدا ئەوەیە بزانرێ كە وشەی (هَذَا) تەواوكەری قسەی بێباوەڕان نیە.

**سێیەم:** لەسەر وشەی (مَنْ) لە ئایەتی {وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ}القيامة٢٧.

---

١ بڕوانە: احكام التلاوة القرءآن الكريم / ٢٦١، بەوەرگرتن لە اللمعة البدرية /٨٨.

**چوارەم:** لەسەر وشەی (بَلْ) لەئایەتی {كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم}المطففين١٤، هۆکاری بێدەنگی لەهەردوو جێگەی سێیەم و چوارەم لە قورئاندا ئەوەیە گومان دروست نەبێت بۆ خوێنەر کە (مَنْ رَاقٍ) و(بَلْ رَانَ) تێهەڵکێشن و بە (مرّاق) و (برّان) بیخوێنێتەوە.

**پێنجەم:** پیتی (ه) لەسەر وشەی (مَالِيَهْ) لە ئایەتی {مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ} الحاقة٢٨، بەڵام ئەم ئایەتە بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە، بێدەنگی یەکێکیانە، دروستیشە بە ئاشکراکردن (أظهار) بخوێنرێتەوە، هەروەها دروستیشە بەبێ بێدەنگی (عدم سكت) بخوێنرێتەوە ئەوکاتەش تێهەڵکێش دەکرێت، چونکە دوو پیتی هاوشێوەن، بۆیە بە (ماليهّلك) دەخوێنرێتەوە.

**شەشەم:** (عَلِيمٌ) لە کۆتایی سورەتی (الأنفال) لە ئایەتی {إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧٥﴾} ٧٥، لەکاتێکدا لەگەڵ سورەتی (التوبة) بخوێنرێتەوە، **ئەوەش یەکێکە لە سێ شێوازی خوێندنەوە کە دروستە پێی بخوێنرێتەوە:**

١. بەشێوازی هەڵگێڕانەوە (قلب) واتە (عليمُمْبرآءة...).

٢. ڕاوەستان (الوقف) **واتە:** ڕاوەستان لە کۆتایی سورەتی (الأنفال) و، هەناسە دان و پاشان دەستپێکردن بە سورەتی (التوبة).

٣. بێدەنگی (السكت) **واتە:** بەبێ هەناسەدان، کە ماوەیەکی کورتترە لە (وقف).

**پێناسەی (القطع):**

لەزمانەوانیدا **واتە:** بڕین ولابردن.

لەزاراوەدا **واتە:** بڕینی خوێندنەوە بەیەکجاری و ڕۆشتنە ناو حاڵەتێکی ترەوە، **واتە:** ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوە بە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)

دەگەڕێیتەوە، بڕینیش تەنها لەکۆتایی ئایەتەکاندا دروستە، (إبن الجزري) لە (عبدالله بن أبي الهذيل) کە یەکێکە لەسەرانی تابیعیەکان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "ئەگەر کەسێکتان ئایەتێکی دەخوێند با نەیبڕێت، تاکو تەواوی دەکات" هەروەها لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: "هاوەڵان حەزیان نەدەکرد لەناوەڕاستی ئایەتدا ڕاوەستی پێش تەواو کردنی هەموو ئایەتەکە" ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەس بۆی نیە لەهەر شوێنێکی ئایەتدا ڕاوەستێت لە نوێژ بێت یان لەدەرەوەی نوێژ، تاکو ئایەتەکە تەواو نەکات[1].

ooo

---

١ بڕوانە: احکام تلاوة القرآن الکریم/ ٢٦٣، بەوەرگرتن لە اللمعة البدرية /٨٩-٩١.

## بابەتی پچڕاو و پێك گەیشتوو
## (المقطوع والموصول)

یەکێك لە پێویستیەگرنگەکانی خوێنەری قورئان ئەوەیە پچڕاو و پێك گەیشتوو لە ئایەتەکاندا بزانێت، واتە: لەسەر کامیان دروستە ڕاوەستێت و لەسەر کامیان دروست نیە.

ئەم بابەتەش دەبێتە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: پێویستە پێکەوە بخوێنرێتەوە.

بەشی دووەم: پێویستە بە پچڕاوی بخوێنرێتەوە.

بەشی سێیەم: جیاوازی لەسەرە. زانایان بە (واجب)یان داناوە لەسەر خوێنەری لێهاتووی قورئان لەم بابەتە شارەزابێت، چونکە هەر وشەیەك بڕاو بێت لە وشەکانی تر، دروستە خوێنەر لەسەری ڕاوەستێت بەمەبەستی فێربوون، یان تاقیکردنەوە، یان هەناسە کورتی و، هۆکاری لەم شێوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ وشەی پاش خۆی پێکگەیشتبێتن دروست نیە ڕاوەستیت لەسەر وشەی دووەم نەبێت، خۆ ئەگەر جیاوازی لەسەر هەبێت لەنێوان زانایاندا ئەوا دروستە خوێنەر ڕاوەستێت لەسەر وشەی یەکەم و دووەمیش.

ooo

## باسەكانی پچڕاو و پێكگەیشتو
## (المقطوع والموصول)

٧٩. وَاعْرِفْ لِمَقْطُوعٍ وَمَوْصُولٍ وَتَا     فِي مُصْحَفِ الإِمَامِ فِيمَا قَدْ أَتَى [١]

---

١ مەبەستی لە موسحەفەكانی ئیمامی عوسمانە كە فەرمانی كرد بە نووسینەوەیان پاش ئەوەی ناكۆكی خەڵكی بینی لەشێوازی خوێندنەوەی قورئان، پێشتر أبوبكر قورئانی كۆكردبوویەوە و، لەلای (حفصة)ی دایكی ئیماندلران دایانابوو (ﷺ)، نووسینەوەی قورئان كەسانێك پێی هەڵسان لە قورەیش بەسەرۆكایەتی (زید بن ثابت) (ﷺ)، لە شێوازی ڕێنووسی قورئان لیژنەكە ئەوەیان ڕەچاو دەكرد ئەو وشەی زیاتر لە خوێندنەوەیەكی تێدا بێت بەشێوازێ بنووسرێت ئەو خوێندنەوانە هەڵبگرێت، نوقتە و جووڵەشیان بۆ پیتەكان نەدەكرد، بۆ نموونە: {فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ}الحجرات٦، بەم شێوە (فتىىوا)یان نووسیوە، بۆیە دەكرێت بە (فتثبتوا)ش بخوێنرێتەوە، وەكو پێشەوایان (حمزة) و (الكسائي) و (خلف العاشر) دەیخوێننەوە، هەروەها دەكرێت بە (فتبینوا)ش بخوێنرێتەوە، وەكو پێشەوایانی تر دەیخوێننەوە، بەڵام كاتێك دەیانبینی شێوازی وشەیەك ناكرێت بەشێوەیەك بنووسرێت كە دوو خوێندنەوە هەڵبگرێت، لە موسحەفێكدا بە شێوەیەك دەیاننووسی بەپێی خوێندنەوەیەك، لە موسحەفێكی تریشدا بەشێوەیەكی تر دەیاننووسی بەپێی خوێندنەوەیەكی تر، بۆ نموونە (تجري تحتها الأنهار) لە موسحەفی مەككە بە ( تجري من تحتها الأنهار) نووسیان بە زیادكردنی وشەی (من)، ئەوەش خوێندنەوەی (إبن كثير المكي)یە، لەپاش نووسینەوەی موسحەفەكان ئیمامی عوسمان (ﷺ) فەرمانی كرد بەناردنیان بۆ شارە ناودارەكان وەكو: (بصرة)، (كوفة)، (شام)، (مكة) موسحەفێكیشی لەلای خۆی بەجێهێشت كە بە (المصحف الأمام) ناسراوە یەكێكیشی بۆ خەڵكی مەدینە تەرخان كرد، لەگەڵ هەموو موسحەفێكیشدا هاوەڵێكی نارد بۆ خوێندنەوە و فێركردنی خەڵكی، بۆیە فەرمانی كرد بە (زید بن ثابت) بە موسحەفی مەدینە قورئان بخوێنێت وە (عبدالله بن السائب)ی نارد بۆ مەككە و، (المغيرة بن أبي شهاب المخزومي) نارد بۆ شام و، (أبو عبدالرحمن السلمي) و ( عامر بن عبد القيس) بۆ بەسرە، بەم شێوەیەش هەموو ناوچەیەك بە موسحەفی خۆی قورئانی دەخوێند، ئوممەتی ئیسلامیش یەك دەنگن لەسەر ڕاستی ئەو شێوازە ڕێنووسانەی كە قورئانیان پێنووسراوەتەوە. بڕوانە: أحكام تلاوة القرآن الكريم/٢٦١.

پێشەوا (إبن الجزري) ڕوو دەکاتە خوێنەری قورئان و پێی دەڵێت: ئەی خوێنەری قورئان، زانا و شارەزابە بە وشە پچڕاو و پێك گەیشتووەکانی قورئانی پیرۆز، ئەوەش بزانە کە پچڕاو لەپێشترە چونکە ئەوە بنچینەیە، هەروەها پێویستە شارەزاییت هەبێت دەربارەی پیتی (ت) لەکاتێکدا زێردار بێت، یان بەشێوازی (ـة)ی کۆتایی بنووسرێت لە قورئاندا، نمونەی (مقطوع) وەکو: {فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ} الأنبياء ٨٧ و، (موصول) وەکو: { أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُ }القيامة٣.

٨٠. فَاقْطَعْ بِعَشْرِ كَلِمَاتٍ أَنْ لا مَـعْ مَلْجَإٍ وَلاَ إِلَــهَ إِلاَّ

٨١. وَتَعْبُدُوا يَاسِينَ ثَانِي هُودَ لاَ يُشْرِكْنَ تُشْرِكْ يَدْخُلَنَ تَعْلُوا عَلَى

٨٢. أَنْ لا يَقُولُوا لاَ أَقُـولَ إِنَّ مَـا بِالرَّعْدِ وَالْمَفْتُوحَ صِلْ وَعَنْ مَـا

(فَاقْطَعْ بِعَشْرِ كَلِمَاتٍ أَنْ لا) فەرمانی کردووە بە پچڕانی (ان) لە (لا) لە (١٠) جێگەی قورئاندا.

١. لەگەڵ وشەی (مَلْجَأَ) لەئایەتی {وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ}التوبة١١٨.

٢. لەگەڵ وشەی (وَلاَ إِلَــهَ إِلاَّ) لەئایەتی {وَأَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ} هود١٤.

٣. لەگەڵ وشەی (تَعْبُدُوا) لەسورەتی (يَاسِينَ) لەئایەتی:{أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ}٦٠.

٤. لەئایەتی {أَن لاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ اللّهَ إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ}هود٢٦، بۆیەش فەرمووی (ثَانِي هُود) لەبەر جیاکردنەوەی لە جێگەی یەکەم {أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ اللّهَ إِنَّنِي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ} هود٢.

٥. لەگەڵ وشەی (يُشْرِكْنَ) لەئایەتی {يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً} الممتحنة١٢.

٦. لەگەڵ وشەی (تُشْرِكْ) لەئایەتی{وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئاً}الحج٢٦.

٧. لەگەڵ وشەی (يَدْخُلَن) لەئایەتی {أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ}القلم٢٤.

٨. لەگەڵ وشەی (لا تَعْلُوا عَلَى) لەئایەتی {وَأَن لَّا تَعلو عَلَى اللهِ} الدخان١٩.

٩. لە (أَن لاَّ يِقُولُواْ) لە ئایەتی {أَن لاَّ يِقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ}الأعراف١٦٩.

١٠. لە (لاَّ أَقُولَ) لەئایەتی {حَقِيقٌ عَلَى أَن لاَّ أَقُولَ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ} الأعراف١٠٥.

سوود: جیاوازی هەیە سەبارەت بە پچڕانی (أَن لَّا) لە ئایەتی {فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ}الأنبياء٨٧، پچڕانیشی لەپێشترە.

(إِنَّ مَـا بِالرَّعْـدِ) فەرمانە بە پچڕانی (ان) لەگەڵ (م) لەیەك جێگەدا، لە ئایەتی {وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ}الرعد٤٠.

(وَالمَفْتُوحَ صِلْ) فەرمانە بە پێك گەیاندنی (أن) لەگەڵ (ما) هەرچۆنێك هاتبێت، بەم شێوەیە (أمّا).

٨٣. نُهُوا اقْطَعُوا مِنْ مَا بِرُومٍ وَالنِّسَا — خُلْفُ المُنَافِقِينَ أَمْ مَنْ أَسَّسَا

٨٤. فُصِّلَتْ النِّسَا وَذِبْحٍ حَيْثُ مَا — وَأَنْ لَمِ المَفْتُوحَ كَسْرُ إِنَّ مَا

٨٥. لأنعَامِ وَالمَفْتُوحَ يَدْعُونَ مَعَا — وَخُلْفُ الأنفَالِ وَنَحْلٍ وَقَعَا

(عَنْ مَا نُهُوا) واتە: (عن) لە (ما) بپچڕێنن تەنها لەیەك لەئایەتی {فَلَمَّا عَتَوْاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ}الأعراف١٦٦.

(اقْطَعُوا مِنْ... المُنَافِقِينَ) واتە: (من) لە (ما) بپچڕێنن لە دوو جێگەی قورئان بەبێ جیاوازی و ناكۆكی:

یەكەم: لەئایەتی {هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم}الروم٢٨.

دووەم: لەئایەتی {فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ}النساء٢٥.

ئاماژەشی بۆ ئەم دوو جێگەیە كردووە (بروم والنسا)، لە جێگەیەكی تریشدا هەیە بەلاّم جیاوازی لەسەرە لە ئایەتی {وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ}المنافقون١٠، پچڕاندنیشی لەپێشترە.

(أم من... وذبح) واتە: (ام) لە (من) لە چوار جێگەی قورئاندا بەبێ جیاوازی لەیەكتر بپچڕێنن:

١. لەئایەتی {خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ}التوبة١٠٩.

٢. لەئایەتی {خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِي آمِناً يَوْمَ الْقِيَامَةِ}فصلت٤٠.

٣. لەئایەتی {أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً} النساء١٠٩.

٤. لەئایەتی {أَم مَّنْ خَلَقْنَا إِنَّا خَلَقْنَاهُم} الصافات١١.

ئاماژەشی کردووە بۆ جێگەکەی سورەتی (الصافات) بە (وَذِبْحٍ) بەهۆی بەسەرهاتی سەربڕینی (اسماعیل) لەو سورەتەدا.

(حَيْثُ مَا) واتە: (حیث) لە (ما) لەهەر شوێنێکدا هات لە قورئاندا بیبچڕێنن، تەنها لە دوو جێگەشدا هاتووە لە قورئاندا:

یەکەم : {وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ} البقرة١٤٤.

دووەم: {وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلاَّ يَكُونَ} البقرة١٥٠.

(وَأَنْ لَمِ الْمَفْتُوحَ كَسْرُ) واتە: (أَنْ) کە هەمزەکەی سەری هەبێت لە (لم) لەهەر شوێنێکی قورئاندا بێت بیبچڕێنن.

(إِنَّ مَا الأَنعَامِ) واتە: (ان) لە(ما) لەیەك جێگەی قورئاندا لەیەکتر بیبچڕێنن، لەئایەتی {إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لآتٍ} الأنعام١٣٤، (وَالْمَفْتُوحَ يَدْعُونَ مَعَا) واتە: (أن ما) لەگەڵ وشەی یدعون لەیەکتر بیبچڕێنن لە دوو جێگەدا:

یەکەم:لەئایەتی {وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ} الحج٦٢.

دووەم: لەئایەتی {وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الْبَاطِلُ} لقمان٣٠.

(وَخُلْفُ الأنفَالِ وَنَحْلٍ وَقَعَا) واتە: جیاوازی هەیە لەدوو جێگەدا:

یەکەم: لەئایەتی {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ} الأنفال٤١.

دووەم: لەئایەتی {إِنَّمَا عِندَ اللّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ}النحل٩٥، پێك گەیاندنیشیان لەپێشترە.

تێبینیش دەكرێت كە جێگەی كۆتایی تایبەتە بە (إن ما) نەك (أن ما) بەم شێوەیە:

(إن ما) لە سورەتی الأنعام دا بەبێ جیاوازی دەپچڕێندرێت، بەڵام لەسورەتی (النمل) دا ناكۆكی لەسەرە و، پێك گەیاندنی لەپێشترە، (أن ما)یش بەبێ جیاوازی دەپچڕێندرێت، لە سورەتی (الحج) و (لقمان)دا، لە سورەتی (الأنفال)یش دا ناكۆكی لەسەرەو، پێك گەیاندنی لەپێشترە. خوای گەورەش زاناترە.

تێبینی: لەم چەند دێڕە هۆنراوەیەدا، وشەی (الأنعام) و(الأنفال) بە (لَنْعام) و (لَنْفال) دەخوێنرێتەوە.

٨٦. وَكُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَاخْتُلِفْ رُدُّوا كَذَا قُلْ بِئْسَمَا وَالْوَصْلُ صِفْ

٨٧. خَلَفْتُمُونِي وَاشْتَرَوْا فِي مَا اقْطَعَا أُوحِيْ أَفَضْتُمْ اشْتَهَتْ يَبْلُوا مَعَا

٨٨. ثَانِي فَعَلْنَ وَقَعَتْ رُومٌ كِلاَ تَنْزِيلُ شُعَرَاءٍ وَغَيْرَ ذِي صِلاَ

(إبن الجزری) فەرمان دەكات بە پچڕاندنی (كُلِّ) لە (مَا) لەیەك جیگەی قورئاندا، بەیەك دەنگی زانایان، لەئایەتی {وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ} إبراهيم٣٤، ناكۆكیش هەیە سەبارەت بە جیاكردنەوەی (كُلِّ) لە (مَا) لەچوارجێگەدا[1]:

---

[1] بڕوانە: (الفتح المجيد) / للقمحاوي، (الدقائق المحكمة) و (أحكام تلاوة القرآن الكريم) لاپەڕە/٢٨٠، بە وەرگرتن لە اللمعة البدرية /٩٢-٩٦.

یەكەم: لەئایەتی {كُلَّ مَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ}النساء٩١.

دووەم: لەئایەتی {كُلَّ مَا جَاء أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ}المؤمنون٤٤.

سێیەم: لەئایەتی {كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا}الأعراف٣٨.

چوارەم: لەئایەتی {كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا}الأعراف٣٨، لەجێگەی یەكەم و دووەم بڕاندنە، بەڵام لەجێگەی سێیەم و چوارەم پێك گەیاندنە، جگە لەم جێگانەش ئاماژەمان پێكرد، هەمووی بە یەك دەنگی زانایان بە پێك گەیاندن دەخوێنرێتەوە.

فەرمان دەكات بە پێك گەیاندنی (بِئْسَ) لەگەڵ (مَا) بەبێ ناكۆكی لەدوو جێگەدا:

یەكەم: لەئایەتی {بِئْسَمَا اشْتَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُواْ}البقرة٩٠، ئەوە جێگەی یەكەمە لە سورەتی (البقرة).

دووەم: لەئایەتی {قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِن بَعْدِيَ}الأعراف١٥٠، ئەوەش لە وتەی (ابن الجزري) (وَالْوَصْلُ صِفْ خَلَفْتُمُونِي وَاشْتَرَوْا) دەردەكەوێت، باسی ئەوەشی كردووە كە لە ئایەتی {قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُمْ }البقرة٩٣، ناكۆكی لەسەر هەیە چونكە فەرموویەتی: (كَذَا قُلْ بِئْسَمَا) بەڵام زیاتر كار بە پچڕاندن دەكرێت لەم جێگەیانەدا، هەروەها فەرمانی كردووە بە پچڕاندنی (فِي) لە (مَا) لە (١١) جێگەدا بەبێ ناكۆكی:

١. {قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ}الأنعام١٤٥

٢. {لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ}النور١٤

٣. {وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ }الأنبياء١٠٢.

٤. {لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ} المائدة٤٨.

٥. {لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ إِنَّ رَبَّكَ} الأنعام١٦٥.

٦. {فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ} البقرة٢٤٠، کەئەمەش جێگەی دووەمە لە سورەتی (البقرة) و، (إبن الجزري) بە (ثَانِي فَعَلْنَ) ئاماژەی پێکردووە.

٧. {وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ} الواقعة٦١.

٨. {ضَرَبَ لَكُم مَّثَلاً مِنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاء فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ} الروم٢٨.

٩. {فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ} الزمر٣.

١٠. {فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ} الزمر٤٦، تێبینی بکە چۆن ئاماژەی کردووە بۆ هەردووە جێگەکەی سورەتی (الزمر) بە (كِلاَ تَنزِيلُ).

١١. {أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ} الشعراء١٤٦، جگە لەم جێگایانەش پێکەوە دەخوێنرێتەوە بەبێ ناکۆکی، ئەوەش لە فەرموودەی (إبن الجزري) (وَغَيْرَ ذِي صِلا) دەردەکەوێت.

٨٩. فَأَيْنَمَا كَالنَّحْلِ صِلْ وَ مُخْتَلِفْ فِي الشُّعَرَا الأَحْزَابِ وَالنِّسَا وُصِفْ

واتە: وشەی (فَأَيْنَمَا) لەهەرکوێیەك هات لە قورئاندا لەگەڵ پیتی (ف) پێکیان بگەیەنە، وەکو چۆن (أَيْنَمَا) لەسورەتی (النَّحْل) پێك دەگەیەنی.

**کەواتە: وشەی (أَینَمَا ) لە دوو جێگەی قورئاندا دێت:**

**یەکەم:** {فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ}البقرة١١٥.

**دووەم:** {أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لاَ يَأْتِ بِخَيْرٍ}النحل٧٦.

(وَ مُخْتَلِفْ) **واتە: لەسێ جێگەی تردا ناکۆکی لەسەرە.**

**یەکەم:** {وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ}الشعراء٩٢.

**دووەم:** {مَلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا}الأحزاب٦١.

**سێیەم:** {أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ}النساء٧٨.

**پچڕاندنیشی لەپێشترە لە سورەتی (الشُّعَرَا) بەلاّم پێك گەیاندنیشی لەپێشترە لە هەردوو جێگەی سورەتی (الأَحْزَابِ) و (وَالنِّسَا ) چونکە فەرموویەتی: (وُصِفْ) واتە: وەسف کراوە.**

٩٠. وَصِلْ فَإِلَّمْ هُودَ أَلَّنْ نَجْعَلاَ    نَجْمَعَ كَيْلاَ تَحْزَنُوا تَأْسَوْا عَلَى

٩١. حَجٌّ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَقَطْعُهُمْ    عَنْ مَنْ يَشَاءُ مَنْ تَوَلَّى يَوْمَ هُمْ

**لێرەدا فەرمان دەکات بە پێك گەیاندنی (إن) و (لم) لەیەك جێگەدا.**

**لەئایەتی** {فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ}هود١٤، **هەروەها فەرمانی کردووە بە پێك گەیاندنی (أن) لەگەڵ (لن) لەدوو جێگەدا:**

یەكەم: {بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِداً} الكهف٤٨.

دووەم: {أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُ} القيامة٣.

بۆ جێگەی یەكەم بە (نَجْعَلا) و بۆ جێگەی دووەم (نَجْمَعَ) ئاماژەی كردووە.

سوود: مامۆستا (محمود خليل الحصري) باسی جیاوازی كردووە لە ئایەتی {أَن لَّن تُحْصُوهُ} المزمل٢٠، كە پچڕاندنی تێیدا لەپێشترە، هەربەوەش كاردەكرێت، وادیارە ڕێڕەوی (إبن الجزري) پچڕاندنێتی و، خوای گەورەش زاناترە.

هەروەها فەرمانی كردووە بە پێك گەیاندنی (كَيْلا) لە چوار جێگەی قورئاندا بەبێ ناكۆكی.

یەكەم: {لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ} ال عمران١٥٣.

دووەم: {لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ} الحديد٢٣.

سێیەم: {لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئاً} الحج٥.

چوارەم: {لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ} الاحزاب٥٠، كە جێگەی دووەمە تێیدا، لە (٣) جێگەكەی تریش بەبێ جیاوازی لەیەكتر پچڕاون، كە بریتین لە:

یەكەم: {لِكَيْ لاَ يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئاً} النحل ٧٠.

دووەم: {لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ} الاحزاب ٣٧، كەجێگەی یەكەمە لە سورەتەكە.

سێیەم: {كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ} الحشر٧.

**هەروەها فەرمانی کردووە بە پچڕاندنی (عَنْ) لە (مَنْ) لەدوو جێگەدا بەبێ جیاوازی:**

**یەکەم:** {وَيَصْرِفُهُ عَن مَن يَشَاء} النور٤٣.

**دووەم:** {فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّى عَن ذِكْرِنَا} النجم٢٩.

**(عَنْ مَنْ)یش تەنها لەم دوو جێگەی قورئاندا هاتوون. پاشان فەرمانی کردووە بە پچڕاندنی (یَوْم) لە (هُمْ) لەدوو جێگەدا بەبێ ناکۆکی:**

**یەکەم:** {يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَى} غافر١٦.

**دووەم:** {يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ} الذاريات١٣.

٩٢. ومَالِ هَـذَا وَالَّذِينَ هَـؤُلاَ　　تَ حِينَ فِي الإمَامِ صِلْ وَوُهِّـلاَ

**لێرەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە پیتی (لِ) کە لە پاش (ما) دێت، بەجیاکراوەیی دەنووسرێت لەچوار جێگەی قورئاندا :**

**یەکەم:** {وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ} الفرقان٧.

**دووەم:** {وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ} الكهف٤٩.

**سێیەم:** {فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ} المعارج٣٦.

**چوارەم:** {فَمَا لِهَؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً} النساء٧٨، **مامۆستا (محمود خليل الحصري) لە (أحكام تلاوة القرآن) لاپەڕە ٢٨٤ دەفەرموێت:**

لەو حاڵەتەشدا خوێنەر بۆی هەیە لەسەر پیتی (ما) یان (ل) ڕاوەستێت بەهۆی كورتی هەناسە یان تاقیكردنەوە و شتی هاوشێوە، بەڵام دروست نیە لە لامەكەوە یان لە (بهؤلاء) و (بالذي) دەست پێبكات، بەڵكو پێویستە لە (ما) دەست پێ بكات.

(تَ حِينَ فِي الإِمَامِ صِلْ) واتە: پیتی (ت) بە پیتی (حين) بگەیەنە وەكو لەم ئایەتەدا هاتووە: (ولات. . .مناص) وەكو: لە موصحەفی (الإمام)ی عوسماندا هاتووە (ﷺ).

(وَوُهِّلا) واتە: بەهەڵە دەخوێنرێتەوە خاوەنی ئەو وتەیە، جیاوازی هەیە لەسەر پچڕاندن و پێك گەیاندنی (ت) لە (حين) بۆچوونی ڕاست و پەسەندیش ئەوەیە لەیەكتر جیابكرێتەوە، واتە: (لات) وشەیەكە و (حين) وشەیەكی ترە، بۆچوونێكی تریش هەیە بەڵام ناپەسەندە، بریتیە لە پێك گەیاندنی (ت) لەگەڵ (حين) لەو حاڵەتەشدا دەبێتە (ولا) (تحين) وەكو دوو وشە، ئەم بۆچوونەشی كارپێنەكراوە، بەبەڵگەی ئەوەی پێشەوا گەورەكانی خوێندنەوەی قورئان لەسەر وشەی (ولات) لەكاتی پێویستیدا ڕاوەستاون ئیتر چی بە (ت) بێت یان بە (ه) لەجیاتی (ت) هیچ كەسێك لەو پێشەوایانە ڕانەوەستاون لەسەر (ولا) بەبێ (ت) ئەم مەسەلەش شتی زۆری لەسەرە، باسكراوە لە كتێب و سەرچاوەكانی تەجویدا[١].

٩٣. وَوَزَنُوهُـمْ وَكَالُوهُـمْ صِـلِ      كَذَا مِنَ الْ وَهَـا وَيَا لاَ تَفْصِلِ

لەم دێڕەدا فەرمانی كردووە بە پێك گەیاندنی (هُـمْ) لەگەڵ هەردوو وشەی (وَوَزَنُوهُـمْ) و (كَالُوهُـمْ) لەئایەتی {وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ}المطففين٣، ئەمەش بە

١ بڕوانە: النشر ج٢، تقريب النشر/٨١، اتحاف فضلاء البشر/١٠٦. بەوەرگرتن لە الدرر البهية ٨٣/٢.

**کۆدەنگی زانایان، دروستیش نیە ڕاوەستان لەسەر وشەی** (كَالُو) **یان** (وَزَنُو) **چونکە ئەوە وەکو ڕاوەستانە لەسەر وشەی** (ثقفتموهم) **لەئایەتی** (حيث ثقفتموهم)**.**

(كَذَا مِنَ الْ وَهَا وَيَا لاَ تَفْصِلِ) **لێرەدا ڕوونی دەکاتەوە کە دروست نیە** (ال) **لە وشەی دوای خۆی جیابکرێتەوە وەکو:** (المؤمنون، التقوى)**، هەروەها دروست نیە** (هـ) **جیابکرێتەوە لەم جۆرە وشانە:** (هأنتم، هؤلاء) **هەروەها دروست نیە** (ي) **لەم جۆرە وشانە** (يأيها، ياآدم) **جیابکرێتەوە.**

**سوود:** (ان) **لەگەڵ** (لو) **تەنها لە چوار جێگەی قورئاندا هاتووە:**

**یەکەم:** {أَن لَّوْ نَشَاء أَصَبْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ }الأعراف١٠٠.

**دووەم:** {أَن لَّوْ يَشَاءُ اللّهُ لَهَدَى النَّاسَ جَمِيعاً}الرعد٣١.

**سێیەم:** {أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ}سبأ١٤.

**چوارەم:** {وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقاً}الجن١٦، **لە هەرسێ جێگاکانی یەکەم و دووەم و سێیەمدا پچڕاون لەیەکتر، لەجێگەی چوارەمیشدا جیاوازی لەسەر هەیە**[1].

**سوود: هەندێ وشەی تر هەیە هەمیشە پێکەوەن و جیاناکرێنەوە، کە بریتین لە:**

١. **(من) لەگەڵ (ما) لەهەرکوێیەکدا بێت لەقورئاندا.**

٢. **(من) لەگەڵ (ما)ی پرسیارکردندا وەکو:** {فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ} **الطارق٥.**

---

١ **بڕوانە: فتح المجيد شرح كتاب العميد/٢٧٠، بەوەرگرتن لە اللمعة البدرية/١٠٢.**

٣. (إِلْ يَاسِين) لەئایەتی {سَلَامٌ عَلَى إِلْ يَاسِينَ}الصافات١٢٣، بەجیا دەنووسرێت بەڵام ڕاوەستان دروست نیە لەسەر (ال).

٤. (نعما) تەنها لە دوو جێگەی قورئاندا هاتووە.

- {إِن تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ}البقرة٢٧١.
- {إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ}النساء٥٨.

٥. مهما لەئایەتی {وَقَالُوا مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِ مِن آيَةٍ}الأعراف١٣٢.

٦. (يوم) لەگەڵ (إذ) هەرچۆنێك بێت.

٧. (حين) لەگەڵ (إذ) هەرچۆنێك بێت.

٨. پیتی (ل) لەگەڵ (إن) لە (لئن).

٩. (لأن) لەگەڵ (لا) لە وشەی (لئلا).

١٠. (وي) لەگەڵ (كأن) لە دوو جێگەی یەك ئایەتدا لە سورەتی (القصص) {وَيْكَأَنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ} ٨٢.

١١. (يَبْنَؤُمَّ) لەئایەتی {قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ}طه٩٤، بەجیاکراوەیش هاتووە لە ئایەتی {قَالَ ابْنَ أُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ}الأعراف١٥٠، هەربۆیە دەکرێت لەسەر (إبن) ڕاوەستیت لە سورەتی (الأعراف) و، دروست نیە ڕاوەستیت لەسەر ئەو پیتە لەسورەتی طه.

١٢. (لولا) هەمیشە بە پێك گەیەنراوی هاتووە، واتە ڕاوەستان دروست نیە لەسەر وشەی (لو)، هەروەها لەسەر وشەی (لوما).

سوود: ڕاوەستان لەسەر وشەی (ما) لەئایەتی {أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ}الإسراء١١٠، هەروەها ڕاوەستان دروستە لەسەر (ايا) بەلام دەستپێکردن دروست نیە تەنها لەسەر (ايا) ەوە نەبێت[1].

٥٥٥

[1] بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە:
- أحكام تلاوة القرآن الكريم/ ٢٨٤.
- مختصر بلوغ الأمنية / ٢٣.

## بابەتی تائەکان

٩٤. وَرَحْمَتُ الزُّخْرُفِ بِالتَّا زَبَرَهْ لاعْرَافِ رُومٍ هُودٍ كَافِ الْبَقَرَهْ

(إبن الجزري) لەم دێڕی هۆنراوەکەیدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە وشەی (رَحْمَتَ) لە موصحەفی عوسماندا (ﷺ) لە **حەوت جێگەی قورئاندا** بە پیتی (ت)ی کراوە نووسراوە:

**یەکەم:** {أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ} الزخرف٣٢.

**دووەم:** {وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ} الزخرف٣٢.

**سێیەم:** {إِنَّ رَحْمَتَ اللهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ} الأعراف٥٦.

**چوارەم:** {فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ} الروم٥٠.

**پێنجەم:** {رَحْمَتُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ} هود٧٣.

**شەشەم:** {ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا} مريم٢.

**حەوتەم:** {أُوْلَـٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللهِ} البقرة٢١٨.

**سوود:** (زَبَرَهْ) **واتە:** نووسی، مەبەست لە پێشەوا عوسمانە (ﷺ)، هەر ئەویش بوو لە بەشی ڕابردوودا بە (في المصحف الإمام) ئاماژەی بۆ کرا.

(الزبور) واتە: نووسراو (ولقد كتبنا في الزبور)[١].

٩٥. نِعْمَتُهَا ثَلاثُ نَحْلٍ إِبْرَهَـمْ          مَعًا أَخِيْرَاتٌ عُقُودُ الثَّانِ هُـمْ

٩٦. لُقْمَانُ ثُمَّ فَاطِرٌ كَالطُّورِ          عِمْرَانَ لَعْنَتَ بِهَا وَالنُّـورِ

ئاگادارمان دەکات لەوەی کە وشەی (نِعْمَتُ) بە تائی کراوە نووسراوە، لە یانزە جێگەی قورئاندا:

یەکەمیان لە ئایەتی {وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ}البقرة٢٣١، سێ جێگەشیان لە سورەتی (النحل) کە دانەر بە (ثَلاثُ نَحْلُ) ئاماژەی پێکردووە، کە بریتین لە:

یەکەم: {أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ} النحل٧٢.

دووەم: {يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا} ٨٣.

سێیەم: {وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ} النحل١١٤.

دوو جێگەشیان لە سورەتی (ئیبراهیم)دایە، کە دانەر بە (إِبْرَهَـمْ مَعًا) ئاماژەی بۆ کردووە:

یەکەم: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا} إبراهيم٢٨.

دووەم: {وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا} إبراهيم٣٤.

---

[١] بڕوانە: القاموس المحيط والمعجم الوسيط، بەوەرگرتن لە اللمعة البدرية .

(مَعًا أَخَيْرَاتٌ) **واتە: كۆتایەكانی هەردوو سورەتی (النحل) و (إبراهیم) وەكو جیاكردنەوە بۆ سەرەتاكانی، یەك جێگەشیان لە سورەتی (المائدة) دایە:** {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ} ١١.

(عُقُودُ الثَّان) **مەبەستی دوو جێگەی لە سورەتی (المائدە)، بۆئەوەی بزانرێ كە مەبەستی یەكەم جێگەی ئەو سورەتە نیە.**

(هَمْ) **كە كردارەكەی تێدایەو، بریتیە لە (هَمْ)، دێڕی دووەمیش باسی چوار جێگەی تری لەخۆ گرتووە:**

**هەشتەم :** {أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ} لقمان٣١.

**نۆیەم :** {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ} فاطر٣.

**دەیەم :** {فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ} الطور٢٩.

**یازدەهەم:** {وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء} آل عمران١٠٣.

(عِمْرَانَ لَعْنَتَ بِهَا وَالنُّورِ) **واتە: وشەی (لعنت) لە دوو جێگەدا لە قورئان بە تائی كراوە نووسراوە:**

**یەكەم:** {ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ} آل عمران٦١.

**دووەم:** {وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ} النور٧.

٩٧ . امْرَأَتٌ يُوسُفَ عِمْرَانَ الْقَصَصْ   تَحْرِيمَ مَعْصِيَتْ بِقَدْ سَمِعْ يُخَصْ

**لێرەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە وشەی (امْرَأَت) بە تائی کراوە نووسراوە لە حەوت جێگەی قورئاندا:**

**یەکەم:** {وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ} یوسف٣٠ .

**دووەم:** {قَالَتِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ الآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ} یوسف٥١ .

**سێیەم:** {إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ} آل عمران٣٥ .

**چوارەم:** {وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ} القصص٩.

**پێنجەم:** {امْرَأَتَ نُوحٍ} التحريم١٠ .

**شەشەم:** {وَامْرَأَتَ لُوطٍ } التحريم١٠ .

**حەوتەم:** {امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ} التحريم١١ .

**قسەیەکی خۆش: هەموو وشەیەکی (إمرأت) ئەگەر لەگەڵ مێردەکەیدا باسکرابێت لە قورئاندا بە (ت)ی کراوە نووسراوە[1].**

(مَعْصِيَتْ بِقَدْ سَمِعْ يُخَصْ) **واتە: وشەی (مَعْصِيَتْ) بە (ت)ی کراوە نووسراوە لە دوو جێگەی سورەتی (المجادلة):**

**یەکەم:** {بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ} المجادلة٨ .

**دووەم:** {فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ} المجادلة٩ .

---

**١ بڕوانە: أحكام تلاوة القرآن الكريم/ ٣٠١.**

٩٨ .شَجَرَتَ الدُّخَان سُنَّتْ فَاطِرِ        كُلاً وَالأنفَالَ وَحَرْفَ غَافِرِ

(شَجَرَتَ الدُّخَان) **واته: وشەی** (شَجَرَت) **بە تائی كراوە نووسراوە، لەئایەتی** {إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ الْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾} الدخان٤٣-٤٤.

(سُنَّتْ) **واته: وشەی** (سُنَّتْ) **بە تائی كراوە نووسراوە، لە پێنج جێگەی قورئاندا:**

**یەكەم:** {فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ} فاطر٤٣.

**دووەم:** {فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا} فاطر٤٣.

**سێیەم:** {وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا} فاطر٤٣.

**چوارەم:** {وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ} الأنفال٣٨.

**پێنجەم:** {سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ} غافر,٨٥

٩٩. قُرَّتُ عَيْنٍ جَنَّتٌ فِي وَقَعَتْ        فِطْرَتْ بَقِيَّتْ وَإِبنَتْ وَكَلِمَتْ

١٠٠.أَوْسَطَ الاعْرَافِ وَكُلُّ مَا اخْتُلِفْ        جَمْعًا وَفَرْدًا فِيهِ بِالتَّاءِ عُرِفْ

(قُرَّتُ عَيْن) **واته: وشەی** (قُرَّت) **بە پیتی (ت)ی كراوە نووسراوە، لە ئایەتی** {قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ} القصص٩.

(جَنَّتُ فِي وَقَعَتْ) **واتە:** وشەی (جَنَّتُ) بە تائی كراوە نووسراوە، لەئایەتی: {فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ} الواقعة٨٩.

(فِطْرَتُ بَقِيَّتُ وَإِبنَتُ) **واتە:** ئەم سێ وشانە بە تائی كراوە نووسراون لەهەركوێ **هاتبێتن وەكو:** {فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا}الروم٣٠ و، لەئایەتی {وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ}التحريم١٢، (وَكَلِمَتُ أَوْسَطَ الاَعْرَافِ) **واتە:** وشەی (كَلِمَتُ) بە پیتی (ت)ی كراوە نووسراوە، لە سورەتی (الاَعْرَافِ) {وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَى} الأعراف١٣٧.

(وَكُلُّ مَا اخْتُلِفْ. . عُرِفْ) **واتە:** هەموو ئەو جێگانەی كە زانایانی قورئان خوێندن ناكۆكیان هەبووە دەربارەی، لەم جێگەیەدا بە تائی كراوە دەنووسرێت:

**بەكورتی:** وشەی (كَلِمَتُ) لە پێنج جێگەی قورئاندا بە (ت)ی كراوە نووسراوە:

**یەكەم:** {وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً}الأنعام١١٥.

**دووەم:** {وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ}الأعراف١٣٧.

**سێیەم:** {كَذَلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا }يونس٣٣.

**چوارەم:** {إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ}يونس٩٦.

**پێنجەم:** {وَكَذَلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا}غافر٦، موسحەفەكانیش جیاوازیان تێدایە لە شێوەی نووسینی وشەی (كَلِمَتُ) لەسێ جێگەی ئەم پێنج جێگەیەدا، كە بریتین لە سورەتی (الأعراف) و (یونس) و (غافر) هەر بۆیە دروستە بە (ت) و (ه)

لەسەریان ڕاوەستیت، بەڵام ئەوەی زیاتر كاریان پێدەكرێت ڕاوەستانە لەسەریان بە (ت)[١].

**هەروەها ئەم وشانە لە قورئاندا بە (ت) ی كراوە نووسراون:**

١. (جِمَالَتٌ) {كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ }المرسلات٣٣.

٢. (بَيِّنَتٍ) {فَهُمْ عَلَى بَيِّنَتٍ مِّنْهُ} فاكر٤٠.

٣. (غَيَابَتِ) {أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ}يوسف١٥.

٤. ناوی كۆكراوە كە بە پیتی (ت) كۆتایی هاتبێت، وەكو: (الآيات، آيات، مبينات، بينات، مبرجات، المؤتفكات، المنشآت، والعاديات، الذاريات، العاديات، المرسلات، النازعات).

٥. ملكوت، جالوت، طالوت، التابوت، الطاغوت.

٦. (أبت) لە سورەكانی (يوسف، مريم، القصص، الصافات).

٧. (هيهات) لەئايەتی {هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ }المؤمنون٣٦.

٨. (مرضات) **لەسێ جێگەی سورەتەكانی:** (البقرة ٢٠٧–٢٦٥)،(النساء ١١٤)،(التحريم ١).

٩. (ذات) لەئايەتی {وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بِينِكُمْ}الأنفال١، {حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ}النمل٦٠.

١٠. (ولات) لەئايەتی {فَنَادَوْا وَلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ}ص٣.

١١. (اللات) لەئايەتی {أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى }النجم١٩.

✿✿✿

---

[١] دەگەڕێتەوە بۆ (سماع) لە قارئەكانەوە. ((م.دلێر گەرمیانی))

## بابەتی هەمزەی پێك گەیاندن
## (همزة الوصل)

**بابزانین هەمزە لەسەرەتای وشەوە دوو جۆرە:**

- **هەمزەی پچڕاندن (همزة القطع):** کە بریتیە لەو هەمزەی جێگیر دەبێت، لەحاڵی دەسپێکردن و بەردەوا مبووندا.

- **هەمزەی پێك گەیاندن (همزة الوصل):** بریتیە لەو هەمزەی کە لە سەرەتای وشەدا جێگیر دەبێت و، لەبەردەوام بووندا نامێنێت[١]، هۆکاری ناونانیشی بەهەمزەی پێك گەیاندن ئەوەیە سەرەڕای ئەوەی لەکاتی پێك گەیاندندا لادەبرێت، بەڵام پێش و پاشی خۆی بەیەکتر دەگەیەنێت، دەڵێنیش هۆکارەکەی ئەوەیە کە قسەکەر بەهۆیەوە دەتوانێت زەنندار (ساکن) دەربڕێت، (الخلیل بن أحمد)یش بە (سُلّم اللسان) واتە: پەیژەی زمان ناوی دەبرد، چونکە هەمیشە دەستپێکردن بە پیتێکی بزواو دەبێت و ڕاوەستانیش بە زەنندار، بۆیە نیاز زۆر بوو بەئامرازێك بۆئەوەی بتوانین زەنندار دەربڕین، ئەو ئامرازەش هەمزەی پێك گەیاندنە.

بزوێنی دەستپێکردن لە کردارەکاندا لەوانەیە بە بۆر (ضمة) بێت و، لەوانەشە بە

١٠١ . وَابْدَأْ بِهَمْزِ الْوَصْلِ مِنْ فِعْلٍ بِضَمْ إِنْ كَانَ ثَالِثٌ مِنَ الفِعْلِ يُضَمْ

(کسرة) بێت، ئەگەر بە بۆر بێت، مەرجی ئەوەیە سێیەم پیتی بۆری هەبێت، بۆنمونە: (لە ڕابوردوودا): (اسْتُحْفِظُواْ، اجْتُثَّتْ، ابْتُلِي) وەکو: لەم ئایەتانەدا هاتووە.

- {وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ}المائدة٤٤.

---

١ بڕوانە: شرح الأشموني و شرح إبن عقیل لەسەر الفیة إبن مالك.

- {وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ}إبراهيم٢٦.
- {هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالاً شَدِيداً}الأحزاب١١.

**نمونەی (فەرمان)یش:**

- {ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ}النحل١٢٥.

{اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ}العنكبوت٤٥، **پێویستە بۆرەكەش (لازم) بێت، نەك توشهاتوو (عارض) وەكو:** (ابْنُوا) **لە ئایەتی** {فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَاناً}الكهف٢١، (وَامْضُوا) **لەئایەتی** {وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ }الحجر٦٥، **ڕوون كردنەوەی ئەم جۆرە وشانەش كە (عارض)ن ئەوەیە، بۆ نموونە: وشەی (اقضوا) بنچینەكەی (أقضيوا)ە بۆیە بۆری (ي)ەكە گۆیزرایەوە بۆ (ض)ەكە و، هەردوو پیتی زەننەداری (ي) و (و) پێك گەیشتن، بۆیە (ي)ەكە بەهۆی یەككرتنی دوو (ساكن) لابرا و، وشەكەش بوو بە (اقضوا)، بەهەمان شێوەش لە وشەكانی تر.**[1]

١٠٢. وَاكْسِرْهُ حَالَ الْكَسْرِ وَالْفَتْحِ وَفِي　　　لاسْمَاءِ غَيْرَ اللاَّمِ كَسْرُهَا وَفِي

(وَاكْسِرْهُ حَالَ الْكَسْرِ وَالْفَتْحِ) **واتە: هەمزەی پێك گەیاندنەكە با (كسرة)ی هەبێت، ئەگەر لەسەرەتای كردارەكەبوو سێیەمی ئەو دوو كردارەش (كسرة) یان (فتحة)دار بوو، وەكو:** (اغْفِر، اتْهوا).

[1] **لە بنەڕەتدا لەسەر وەزنی (يَفْعِل)ە كەواتە كەواتە عەینی فیعلەكە (كسرة)یە. ((م.دلێر گەرمیانی))**

**بەکورتی: بزوێنی دەستپێکردن بە ژێر (کسرة) مەرجەکەی ئەوەیە پیتی سێیەمی کردارەکەیان سەر (فتحة)ی هەبێت وەکو:** {وَإِذَا انقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انقَلَبُوا فَكِهِينَ}المطففين٣١، **یان ژێر (کسرة)ی هەبێت وەکو:** {رَّبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ}الدخان١٢.

(وَفِي الاسْمَاءِ) **واتە: ئەو ناوانەی کە بە هەمزەی پێك گەیاندن دەست پێدەکات.**

(كَسْرُهَا) **واتە: ژێر دانان بۆ هەمزەکە، جگە لە (ال) کە جیایکردووەتەوە.**

(غَيْرَ اللاَّم) **واتە: جگە لە هەمزەی (ال)ی ناساندن (التعریف)، چونکە لەو حاڵەتەدا سەر (فتحة)ی هەیە وەکو:** (النهار).

١٠٣. إبن مَعَ إبنةِ امْرِئٍ وَاثْنَيْنِ          وَامْرَأَةٍ وَاسْمٍ مَعَ اثْنَتَيْنِ

**لەم دێڕەدا باسی هەندێ ناومان بۆ دەکات کە بە هەمزەی پێك گەیاندن دەنووسرێت، لەکاتی دەست پێکردندا بە ژێر (کسرة) دەست پێدەکات، ئەو ناوانەش بریتین لە:**

١. (إبن) **وەکو:** { إِنَّ ابْنِي مِنْ أَهْلِي}هود٤٥.

٢. (إبنة) **وەکو:** {وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ}التحريم١٢.

٣. (امرئ) **وەکو:** {إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ}النساء١٧٦.

٤. (اثنين) **وەکو:** {ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ}التوبة٤٠.

٥. (امرأة) **وەکو:** {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ}النساء١٢٨.

٦. (اسم) وەكو: {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} الأعلى١.

٧. (اثنَين) وەكو: {فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ} النساء١٧٦،

**ڕوون كردنەوە:** با بزانیت كە هەمزەی پێك گەیاندن (همزة الوصل) لەهەموو كردارێكی ڕابردوودا هەیە كەبریتیە لە زیاتر لە چوار پیت واتە: (پێنجی یان شەشی بێت) وەكو: (انطلق – استخرج) هەروەها لە چاووگی ئەو كردارانەش وەكو: (انطلاق – استخراج).

هەروەها ژێریشیان هەیە (مكسور)ن، لەو ناوانەی لای خوارەوە:

(إبن – إبنة – امرؤ – امرئ – امرأة – اثنان – اثنين – اثنتين – اسم).

بە هەمان شێوە بە ژێر (كسرة) دەست پێ دەكرێت ئەگەر سێیەم پیتی كردارەكە ژێری هەبێت، بەپێی بنچینەكەی دواتر بۆر (ضمة)ی توش هاتبێت، لەو جۆرەش لە قورئاندا پێنج كردار هاتووە:

١. (امشوا) لەئایەتی {أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ} ص٦.

٢. (ايتوا) لەئایەتی {ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَذَا} الأحقاف٤.

٣. (إبنوا) لەئایەتی {قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَاناً فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ} الصافات٩٧.

٤. (اقضوا) لەئایەتی {ثُمَّ اقْضُوا إِلَيَّ وَلاَ تُنظِرُونِ} يونس٧١.

٥. (امضوا) لەئایەتی {وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ} الحجر٦٥.

چونكە بنچینەی ئەو كردارانە بریتین لە: (امشیوا)، (ایتیوا)، (إبنیوا)، (اقضیوا)، (امضیوا).

سوود: ئەگەر ڕاوەستایت لەسەر وشەی (بئس) بۆ پێویستی یان تاقیکردنەوە، یان هەر هۆکارێکی تر و، ویستت بە (الإسم) دەست پێبکەیت لە سورەتی (الحجرات) لەئایەتی {بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ}الحجرات١١، لەو حاڵەتەدا دوو شێوازت لە بەردەمدایە بۆ خوێندنەوەی:

١. دەست پێکردن بە هەمزەی پێك گەیاندن بەسەر (فتحة) و، واتە: (أَلِسْمُ).

٢. لابردنی هەمزەکەو، دەست پێکردن بە لامێکی ژێردار، واتە: (لِسْمُ) بەڵام لەحاڵەتی پێك گەیاندنی (بِئْس) بە (الإسم) تەنها بەیەك شێواز دەخوێنرێتەوە ئەویش لابردنی هەمزەی پێك گەیاندن و دانانی ژێرە بۆ لامەکە، واتە وەکو حاڵەتی دووەم[١].

٭٭٭

---

١ بڕوانە: أحكام تلاوة القرآن الكريم ٤٢٣.

# بابەتی ڕەوم و ئیشمام

١٠٤. وَحَاذِرِ الْوَقْفَ بِكُلِّ الحَرَكَهْ    إِلاَّ إِذَا رُمْتَ فَبَعْضُ حَرَكَهْ

١٠٥. إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ وَأَشِمْ    إِشَارَةً بِالضَّمِّ فِي رَفْعٍ وَضَمْ

(وَحَاذِرِ) **واتە:** وورِیابە لەوەی.

(الْوَقْفَ بِكُلِّ الحَرَكَهْ) **واتە:** بە هەموو جوڵەکە لەسەر پیتی کۆتایی وشەوە ڕاوەستیت، وەکو هەندێ –بۆ نمونە– لە وشەی (تَبَّ) لەئایەتی: {تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ}المسد١، ئەنجامی دەدەن، چونکە لە پیتی کۆتایی وشە پێویستە بە زەننە (سکون) ڕاوەستێت.

(إِلاَّ إِذَا رُمْتَ) **واتە:** مەگەر لە حاڵەتێکدا بە ڕەوم ڕاوەستیت، لەو حاڵەتەدا ڕێگەت دراوە هەندێ لە جوڵەی پیتەکە دەربڕیت سەرەڕای ئەوەش کە لەسەری ڕاوەستاوی.

(إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ) **واتە:** مەگەر لە حاڵتێکدا ئەو پیتەی لەسەری ڕاوەستابیت (فتحة)ی هەبێت، یان (منصوب) بێت، درووست نیە بە ڕەوم لەسەری ڕاوەستیت.

(وَأَشِـمْ إِشَـارَةً بِالضَّمِّ فِـي رَفْـعٍ وَضَـمْ) **واتە:** بۆت هەیە ئەگەر ئەو پیتەی لەسەری ڕاوەستایت بۆر (ضمة)ی هەبێت یان (مرفوع) بێت، بە (إشمام) ڕاوەستیت.

(الرَّوم): **واتە:** دەربڕینی هەندێ لە جوڵەی پیتەکە، داگرتنی دەنگ لەکاتی دەربڕیندا.

(الإشمام): لە (شم)ەوە هاتووە، **واتە:** بۆن، وەکو ئەوەی بۆنی سەروبۆر (حرکة)ت بە پیتەکە دابێت.

**ئاگاداری:** فێربوونی دەربڕینی (الرَّوم) و (الإشمام) لەلای مامۆستای شارەزا دەبێت، ناکرێت لە کتێبەوە وەربگیردرێت.

**جۆرەکانی ڕاوەستان لەسەر کۆتایی پیتەکان:**

١. زەننەی پەتی (السکون المحض)، بنچینەش ئەم شێوە ڕاوەستانەیە چونکە مەبەست پشوو دانە و، لابردنی سەروبۆریش کاریگەر ترە بۆ بەدەست هێنانی ئەو پشووە.

٢. ڕاوەستان بە ڕەوم: **واتە:** کەم کردنەوە و داگرتنی دەنگ بە بزوانی پیتەکە، بەشێوەیەك بەو لاوازکردنە زۆربەی بڕوات و نەمێنێ، هەندێکیش لە زانایان دەڵێن ڕەوم بریتیە لە دەربڕینی هەندێك لە جوڵەی پیتەکە، **واتە:** سێیەکی جوڵەکە بەپێی بۆچوونی هەندێ لە زانایان، ئەم حاڵەتەش لە پیتی بۆر (ضمة) دار و، ژێر (کسرة) دار دا درووست دەبێت نەك لەحاڵەتی (فتحة).

٣. ڕاوەستان بە (إشمام) کە بریتیە لە ئاماژە کردن بە لێو بەبێ دەربڕینی دەنگ لەپاش تەواو کردنی پیتی کۆتایی بە زەننە داری، بەکورتی (إشمام) بەچاو دەبینرێت و، بەگوێ نابیسترێت، بۆیە کەسی نابینا هەست بە ئیشمام ناکات، بەپێچەوانەی ڕەوم کە لە ڕێگەی بیستنەوە هەستی پێدەکرێت.

❂❂❂

## سوودی ڕاوەستان بە ڕەوم و ئیشمام

زانای گەورە (إبن الجزري) لە کتێبی (النشر ج ٢ /١٢٥) فەرموویەتی:

(سوودی ئاماژە کردن لە ڕاوەستاندا بە ڕەوم و ئیشمام دەرخستنی سەروبۆرە کە لە کاتی بەردەوام بووندا جێگیر دەبێت، بۆئەوەی چۆنێتی ئەو سەروبۆرە لە سەری ڕاوەستیت ئاشکرا بێت).

ئەمەش شتێکی باشە لەحاڵەتێکدا بێت کەسێك گوێ لە خوێنەرەکە بگرێت، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر خوێنەر بەتەنها بێت لەو حاڵەتەدا پێویستی بە ئەو دەرخستنە نیە، جا ئەگەر گوێگر شارەزا بێت بە دروستی خوێندنەوەی خوێنەرەکە دەزانێت، ئەگەر شارەزایش نەبێت بۆی دەبێتە ئاگەدارکردنەوەیەك بۆئەوەی حوکمی ڕاوەستان لەسەر ئەو پیتە بزانێت، ئەگەر خوێنەرەکەش قوتابی زانست بێت بۆ مامۆستاکەی دەردەکەوێت خوێندنەوەکەی ڕاستە تاکو پەسەندی بکات، یان هەڵەیە و بۆی چاك بکاتەوە.

زۆرجاریش قوتابیە سەرەتاییەکانی زانست و کەسانی تر لێیان تێکدەچێت، بەتایبەتی ئەوانەی کە لەبەر دەستی مامۆستادا فێری قورئان خوێندن نەبوونە چۆن جیاوازی بکەن لە سەروبۆری کۆتایی وشەکاندا، وەکو: (وفوق كل ذي علم عليم) یان (اني لما انزلت الىي من خير فقير)، چونکە ئەوان هەمیشە ڕاهاتوون بە (سکون) لە کۆتایی وشەکاندا ڕاوەستن، بۆیە نازانن چۆن وشەی (عليم) و(فقير) لەکاتی بەردەوام بووندا بخوێننەوە ئایا بە (ضمة) یان بە (کسرة)؟ بۆیە زۆر لە مامۆستایانمان

فەرمانیان پێدەکردین ئاماژە بکەین بە لێومان، هەندێکیشیان فەرمانیان پێدەکردین ڕانەوەستین لەسەر ئەو وشانە و بەردەوام بین، ئەوەش کارێکی جوانە.

**دەڵێم:**

ئەم وتەی پێشەوا (إبن الجزري) مەبەستی ئەو کەسەیە کە قورئان لەبەر بخوێنێتەوە – کە قوتابیانی ئەو سەردەمە بەگشتی لەبەر خوێندوویانەتەوە – چونکە لە موسحەفدا ئەو سەروبۆرانە ئاماژەیان پێکراوە.

١٠٦. وَقَدْ تَقَضَّى نَظْمِيَ الْمُقَدِّمَهْ ‌ ‌ ‌ مِنِّي لِقَارِئِ الْقُرْآنِ تَقْدِمَهْ

(وَقَدْ تَقَضَّى) **واتە:** کۆتایی پێ هات و تەواو بوو.

(نَظْمِي) **واتە:** هۆنراوەکەم کە لەم زانستەدا ڕێکم خستبوو.

(الْمُقَدِّمَهْ) **واتە:** وەکو دیارییەك.

**واتە:** هۆنراوەکەم بریتیە لە سەد و حەوت دێڕ، هەرکەسێك بە جوانی شارەزابێت

١٠٧. أَبْيَاتُهَا قَافٌ وَزَايٌ فِي الْعَدَدْ ‌ ‌ ‌ مَنْ يُحْسِنِ التَّجْوِيدَ يَظْفَرْ بِالرَّشَدْ

لە زانستی تەجوید ڕێنوێنی کراوە و، ڕێگەی زانستی دۆزیوەتەوە.

پیتی (زَايٌ) بەرانبەر ژمارە حەوتە.

پیتی (قَافٌ ) بەرانبەر ژمارە سەدە.

لەشەرحی (تحفة الاطفال) کە(١٢) وانەی دەنگییە لەمالبەری(اسلام هاوس) و (اسلامکورد) بلاوبووەتەوە بەشیکراوەیی باسی بیتەکانی زمانی عەرەبی و زمارەکانم کردووە لەبەرانبەریاندا .

**واتە:** هۆنینەوەم بۆ ئەم پێشەکیە لە زانستی تەجوید و خوێندنەوەی قورئان کۆتایی پێ هات، ئەوەش دیارییەکە لە منەوە بۆ خوێنەری قورئان.

١٠٨. (وَالحَمْدُ للهِ) لَهَا خِتَامْ ثُمَّ الصَّلَاةُ بَعْدُ وَالسَّلَامُ

١٠٩. عَلَى النَّبِيِّ المُصْطَفَى وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وتَابِعِي مِنْوَالِهِ

**واتە:** کۆتایی بەم کارە دەهێنم بە سوپاس و ستایش کردنی خوای گەورەو، درووود و سلاّو ناردن بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری هەڵبژاردە (ﷺ) هەروەها بۆسەر یارو یاوەرانی و شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەی بە گشتی.

ئەمە دوا دێڕی هۆنراوەکەیە، کەتێیدا سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکات لەسەر ئەنجامدانی کارەکەی، هەروەها درووود و سلاّو دەنێرێتە سەر گیانی پاکی موحەممەد (ﷺ) بەلاّم دێڕەکە جۆرێك لە نوقسانی تێدایە، چونکە ئاماژەی نەکردووە بۆ ئەو کەسەی کە درووود و سلاّوی بۆ ناردووە ئەگەر چی ئاشکراشە کە پێغەمبەرە (ﷺ)، بۆیە یەکەمین کەسیش کەهەوڵیدا ئەوە چارەسەر بکات بە دێڕی ١٠٨ (عبدالدائم الأزهري) قوتابی (ابن الجزري) بوو کە لە ساڵی (٨٧٠ ك) کۆچی دوایی کردووە[١].

۞۞۞

١ بڕوانە: الشرح الوجيز على الجزرية / ١٥٣.

## پاشكۆی ژمارە (١)

# چەند تێبینیەكی گرنگ لەكاتی خوێندنەوەی قورئاندا بە ڕیوایەتی (حفص عن عاصم)

١. وشەی (ءَاْعْجَمِيٌّ) لە ئایەتی {ءَاْعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ}فصلت٤٤، بە تەسهیل دەخوێنرێتەوە، واتە: نە بەهەمزەی تەواو و نە بە ئەلیفی تەواو، تەنها پێویستە بەم شێوەش بخوێنرێتەوە.

٢. وشەی (مَجْرَاهَا) لە ئایەتی {بِسْمِ اللهِ مَجْرِيهَا وَمُرْسَاهَا}هود٤١، بە (إمالة) دەخوێنرێتەوە، واتە: بەنزیك كردنەوەی (فتحة)كە بەرەو (كسرة) و،ئەلیفەكە بەرە و (ي).

٣. (ضَعْفٍ) لەئایەتی {اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفاً وَشَيْبَةً}الروم٥٤، ئەو وشە لە هەرسێ جێگەی ئایەتەكەدا دەكرێ پیتی (ض) بە (فتحة) و بە (ضمة) بخوێنرێتەوە، بەلاَم (فتحة) لەپێشترە.

٤. (وَيَبْصُۜطُ) لەئایەتی { وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ }البقرة٢٤٥، بە سینی پەتی دەخوێنرێتەوە.

٥. (بَصْۜطَةً) لەئایەتی {وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَصْۜطَةً}الأعراف٦٩، بەسینی تەواو دەخوێنرێتەوە.

٦. (ٱلْمُصَيْطِرُونَ) لەئایەتی { أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ }الطور٣٧، بە (ص) و بە (س) دەخوێنرێتەوە، بەلاَم دەربڕینی بە (ص) بەناوبانگترە.

**٧. (بِمُصَيْطِرٍ) لەئايەتی** {لَسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ} الغاشية ٢٢، **بە (ص) ی تەواو دەخوێنرێتەوە.**

**٨. لابردنی ئەليف لەكاتی بەردەوام بوون و، جێگير كردنی لەكاتی ڕاوەستاندا، لەم وشانەی لای خوارەوە:**

(أَنَاْ) **لەهەركوێيەكی قورئاندا بێت، وەكو:** {وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَاْ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ} يوسف٤٥.

(لَّكِنَّا) **لەئايەتی** {لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَداً} الكهف٣٨، (الظُّنُونَا) **لەئايەتی** {وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا} الأحزاب١٠، (الرَّسُولَا) **لەئايەتی** {يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا} الأحزاب٦٦، (السَّبِيلَا) **لەئايەتی** {وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا} الأحزاب٦٧، (قَوَارِيرَا) الإنسان١٥، **لە جێگەی يەكەمی ئايەتی:** {وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا} الإنسان١٥، **هەموو ئەم وشانە بە جێگيركردنی پيتی ئەليف لەكاتی ڕاوەستاندا و لابردنی لەكاتی بەردەوام بووندا دەخوێنرێتەوە، بەڵام (قَوَارِيرَ) لەجێگەی دووەمی سورەتی** (الإنسان) {قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ}، **لادەبرێت لەبەردەوام بوون و ڕاوەستاندا.**

**٩. (سَلَاسِلَا) لەئايەتی** {إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَا وَأَغْلَالاً وَسَعِيراً} الإنسان٤، **لە بەردەوام بووندا لامەكەی بە (فتحة) دەخوێنرێتەوە بەبێ تەنوين، لەڕاوەستانيشدا يان بە ئەليف دەخوێنرێتەوە، يان بە (ساكن) كردنی لامەكە، هەردوو شێوە خوێندنەكەشی ڕاستن.**

١٠. خوێندنەوەی ئەم وشانەی لای خوارەوە بە نون لەبەردەوام بووندا و، بە ئەلیف لە ڕاوەستاندا:

(ولیكونا)، (لنسفعا)، (واذا)، (ولیکونا)، لەئایەتی {قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسَتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُوناً مِّنَ الصَّاغِرِينَ}یوسف٣٢، (لَنَسْفَعاً) لەئایەتی {كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ} العلق١٥.

١١. (ءاتین) لەسورەتی النمل٣٦، لەکاتی بەردەوام بووندا بە (ي) دەخوێنرێتەوە، لەکاتی ڕاوەستاندا دوو شێوە خوێندنی هەیە: جێگیرکردنی (ي) و لابردنی.

١٢. (الإِسْمُ) لەئایەتی {بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ}الحجرات١١، لەکاتی دەستپێکردن لەو وشەوەوە دوو شێواز خوێندنەوەی هەیە: دەسپێکردن بەهەمزەیەکی (فتحة)دار و لامێکی (کسرە)دار، یان بەلابردنی هەمزەی پێك گەیاندن و، دەستپێکردنی بە لامێك (کسرة)ی هەبێت و سینێکی زەننەدار.

١٣. خوێندنەوەی ئەم وشانە بە (مد)ی درێژ (شەش جووڵە) یان بە (تسهیل)، وشەکانیش بریتین لە: (ءالذکرین) لەهەردوو جێگەی سورەتی (الأنعام) و (آلآن) لەهەردوو جێگەی سورەتی (یونس) و، (ءالله) لە سورەتی (یونس) و (النمل) درێژکردنەوەشی بۆ شەش جووڵە پەسەند ترە.

١٤. پیتی (ع) لەهەریەك لە ئایەتی {كهيعص}ی سەرەتای مەریەم و، {حم٦ عسق}ی سەرەتای (الشوری)، دروستە بە (توسط) چوار جووڵە، یان (اشباع) شەش جووڵە کەئەوەش چاکترە.

١٥. (تَأْمَنَّا) لەئایەتی {قَالُوا يَا أَبَانَا مَا لَكَ لاَ تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ}يوسف١١، بە (إشمام) یان بە (روم) دەخوێنرێتەوە.

١٦. **لەچوار جێگەی قورئاندا بێ دەنگی (السکت) پێویستە لەلای (حفص)** جیاواز لەهەموو خوێنەرەکانی قورئان.

- بێ دەنگی لەسەر ئەلیفی {عِوَجَا}الكهف١.
- بێ دەنگی لەسەر ئەلیفی { مَّرْقَدِنَا}يس٥٢.
- بێ دەنگی لەسەر نونی {مَنْ رَاقٍ}القيامة٢٧.
- بێ دەنگی لەسەر لامی {بَلْ رَانَ}المطففين١٤.

١٧. ساکن کردنی پیتی (هـ) لە وشەی {أَرْجِهْ} لە سورەتی (الأعراف) و (الشعراء)، هەروەها وشەی (أَلْقِهْ) لەسورەتی النمل، هەروەها خوێندنەوەی پیتی (ه) بە (ضمة) و، بەبێ پێککەیاندن (صلة) لەوشەی {يَرْضَهُ لَكُمْ} لە سورەتی الزمر، بەڵام وشەی {وَيَتَّقْهِ} لە سورەتی النور لە ئایەتی٥٢ (حفص) بە (ساکن) کردنی پیتی (ق) و (کسرە) دانان بۆ پیتی (ه) خوێندوویەتیەوە بەبێ پێککەیاندن.

١٨. دەرخستنی پیتی (ن) لەلای (و) لەهەردوو ئایەتی {يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ } و {نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ}القلم١.

١٩. تێهەڵکێشانی پیتی (ث) بە پیتی (ذ) لەئایەتی {يَلْهَث ذَّلِكَ} لە سورەتی الأعراف١٧٦، هەروەها تێهەڵکێشانی پیتی (ب) بە پیتی (م) لەئایەتی٤٢ {يَا بُنَيَّ ارْكَب

مَّعَنَا} لە سورەتی هود، بەشێوەیەكی تەواو بەهۆی ئەو هاوچەشنیەی كە لە نێوان هەردوو پیتەكەدا هەیە.

٢٠. وشەی (نَخْلُقكُّم) لەئایەتی {أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ}المرسلات٢٠، جیاوازی هەیە سەبارەت بە تێهەڵكێشانی هەردوو پیتی (ق) و (ك) بەتەواوەتی یان بە ناتەواوی، (إبن الجزري)یش بۆ ئەم جیاوازیە ئاماژەی كردووە و فەرموویەتی: (والخلف بنخلقكم وقع)، هەردوو شێوازەكەش ڕاستن، تێهەڵكێش كردنی تەواو (أدغام كامل) واتە: پیتی (ق) بخرێتە ناو پیتی (ك) و دیارنەمێنێ، تێهەڵكێش كردنی ناتەواویش (أدغام ناقص) واتە: مانەوەی سیفەتی بەرزی لە (ق) و لاچوونی سیفەتی (قلقلة) تێیدا، بەلاَم (إبن الجزري) سیفەتی تێهەڵكێشی تەواوی هەڵبژاردووە[١].

۞۞۞

---

[١] بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد ٢٦٣-٢٦٦.

## پاشکۆی ژمارە (٢)

هەندێ لە داهێنان (بدعة)ی قورئان خوێنەکان کەزانایان ورییایان داوە دەربارەی[1]:

١. زۆر لەخۆکردن و توشبوونی گومان، وەسوەسە لە مەخرەجی پیتەکاندا، واتە: زێدە ڕەوی کردن و خۆگوڕین لەکاتی دەربڕینی پیتەکان و قورس کردنەوەیان بەشێوەیەکی بەرچاو.

٢. دەربڕینی ئاواز و درێژکردنەوەی پیتەکان زیاد لە ئاستی خۆیان.

٣. ئاواز بۆدانانی سورەتەکان، وەکو چۆن ئاواز بۆ گۆرانی دادەنرێت.

٤. خوێندنەوەی قورئان لەچەشنی گۆرانی و زۆر دووبارە کردنەوەی ئایەتەکان هاوکات لەگەڵ خۆگوڕین و زۆر لەخۆکردن و، ڕاهێنانی زۆر لەسەر ئاوازی جۆراوجۆر کە بە فێربوون و هەوڵی زۆر بەدەستی دەهێنن.

٥. لە خوێندنەوەی قورئاندا گوێگر خەریکی جگەرەکێشان بێت، یان گوێگران خەریکی خواردن و خواردنەوە بن.

٦. خوێندنەوەی قورئان بە (القراءات الشاذة)، کە جێگیر نەبوونە، پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان بەو شێوەیە خوێندبێتیانەوە.

---

[1] بڕوانە: بدع القراء القديمة و المعاصرة، بكر بن عبدالله أبو زيد، بەوەرگرتن لە کتێبی/ بسط المقال في شرح تحفة الأطفال / ٧٩-٨١.

٧. کۆکردنەوە لەنێوان دوو شێوازی خوێندنەوە لە یەك ئایەتدا، لەنوێژدا بێت یان لەهەر شوێنێکی تر بێت بۆ خۆهەڵکێشان.

(دەڵێم: زۆرێك لە خوێنەرە بەناوبانگەکانی میسر هەڵدەستن بە کۆکردنەوە لە نێوان چەند خوێندنەوەیەکدا).

٨. تایبەت کردنی هەندێ ئایەت یان سورەت لەنوێژدا، یان لەهەر کات و شوێنێکدا، یان لەبەر پێویستیەکی دیاری کراو.

٩. وابەستە بوونی خوێنەر یان گوێگر بەهەندێ نزا و ویردەوە، کە بەڵگەی لەسەر نەهاتووە لەکاتی خوێندنەوەی ئایەتێك یان سورەتێك، بۆ نمونە: خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) لەپاش قورئان خوێندن، یان لەکاتی بیستنی سورەتی (الفاتحة) بڵێیت: (صلوا علیه وسلموا تسلیما).

١٠. یان ئەوەی گوێگران بۆ خوێنەری قورئان بڵێن: (الله الله)، یان هەر وشەیەکی تر لەو بارەوە کە بۆ خوێنەر تەرخان بکرێت، خوای گەورە فەرموویەتی: (وإذا قرئ القرءآن فاستمعوا له وانصتوا لعلكم ترحمون).

(دەڵێم: دیسان شوێن و سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەم هاوار و هاندان و ژاوەژاوە لەکاتی قورئاندا وڵاتی میسرە و لەوێیشەوە هەناردە کرا بۆ وڵاتانی تر، واشدەردەکەوێت ئەو قورئان خوێنانە پێخۆشحاڵ دەبن بەو هاوار و سەرسامی دەربڕینەی جەماوەر لە دەنگیان و، دەبێتە مایەی ئەوەی ئەوەندەی تر دەنگی خۆیان خۆش بکەنەوە و داهێنان بکەن لە ئاوازەکانی خوێندنەوەیاندا).

١١. خوێنەر هەردوو دەستی، یان دەستێكی بخاتە سەر گوێی لەكاتی قورئان خوێندنەوەدا وەكو زۆرێك لە خوێنەرە میسریەكان وخوێنەرانی تر دەیكەن[١].

١٢. وتنی (صدق الله العظیم) چونكە هیچ بنچینەیەكی شەرعی نییە لە كرداری پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان و شوێنكەوتوانیان، چاكەیەكیش ئەوان ڕێگەیان پێ نەبردبێت چاك نیە.

۞۞۞

١ بڕوانە: بسط المقال في شرح تحفة الأطفال ٧٩-٨١.

# پاشكۆی ژمارە (٣)

## پێناسەی هەندێك لەو زانایانەی ناویان لەم كتێبەدا هاتووە

**الفراهيدي:**

خەلیلی كوڕی ئەحمەد، سەرگەورەی زانایانی زمان و وێژەیە بەگشتی لە زانستدا، یەكەمین كەسە كە زانستی (العَروض)ی داهێنا، مامۆستای (سيبويه) و (الأصمعي) و زۆر لە زانایانی تر بوو، لە بەسرە، دانەری كتێبی (العين)ە، كە یەكەمین فەرهەنكە لە زمانی عەرەبیدالە ساڵی ١٧٣ ك كۆچی دوایی كردووە.

**سيبويه:**

عەمری كوڕی عوسمانی كوڕی قەمبەر، پێشەوای خەڵكی بەسرە لە زانسی (النحو)، (سيبويه) واتە: بۆنی سێو بە فارسی، یەكێكە لە گەورەترین زانایانی زمانی عەرەبی لە درێژایی مێژودا لەساڵی (١٨٠) ك وەفاتی كردووە.

**الفراء:**

یەحیای كوڕی زیادی كوفی، بە (أمير المؤمنين) دەناسرێت لە زانستی (نحو)، ناونرا بە (الفراء) واتە: "لەتكەر"، چونكە وتەكانی لەت دەكرد و لێی ورد دەبوویەوە،

خۆیی‌و (الکسائي) شارەزاترین خەڵکی کوفە بوون لە (نحو)، لەساڵی ٢٠٧ك وەفاتی کردووە.

## الشاطبي:

(القاسم بن فيرُّه)ی نابینا، لەساڵی ٥٣٨ ك لە ئەندەلوس لەدایك بووە، قیرائاتی لەوێ تەواو کردووە دواتر کۆچی بۆ میسر کردووە و (القاضي الفاضل)ی وەزیری (صلاح الدين الأيوبي) ڕێزی زۆری لێگرت و کردی بە مامۆستای قوتابخانەی (الفاضلية)، کتێبی زۆری لە قیرائاتدا داناوە بەتایبەتی ئەو هۆنراوەی کە بە (الشاطبية) دەناسرێت، پێشەوایەکی گەورە و سەرسوڕهێنەر بوو لە زانستەکاندا، دونیا نەویست و خواپەرست بوو لەساڵی ٥٩٠ ك وەفاتی کردووە.

## زكريا الأنصاري:

کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی میسری شافیعی، (مفسر و حافظ)ی فەرموودەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، لەساڵی ٨٢٣ ك لەدایك بووە و، لە ٩٢٦ ك وەفاتی کردووە، یەکێکە لەو زانایانەی پێشەکی (إبن الجزري) لێکداوەتەوە.

## طاش كبري زادة:

ئەحمەدی کوڕی موستەفا، لە ساڵی ٩٠١ ك لەدایك بووە، زانایەکی تورکی حەنەفی گەورەیە، نووسینی لە زۆر لە زانستەکاندا هەیە، لەوانەش لێکدانەوەی بۆ پێشەکی (الجزرية)، لەساڵی ٩٦٨ ك کۆچی دوایی کردووە.

## ملا علي القاري:

ناوی سوڵتانی کوڕی موحەممەد نورەددین، لەشاری (هزە) لەدایك بووە و کۆچی کردووە بۆ مەککە و تێیدا جێگیر بووە و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کردووە لەساڵی ١٠١٤ك، زانایەکی حەنەفی بووە لەسەرانی زانست لەسەردەمی خۆیدا، دەڵێن ساڵانە بە خەتی خۆی موسحەفێکی بە پەراوێزی قیرائات و تەفسیرەوە دەنووسی و دەیفرۆشت و خەرجی ساڵەکەی بۆ دابین دەکرد.

## محمد المتولي:

سەرگەورەی قورئان خوێنە میسریەکانە، لە ڕۆژگاری خۆیدا، نابینا بوو، زاناو لێکۆلەرەوەیەکی گەورە بوو لە زانستەکانی قورئاندا، نزیکەی (٤٠) کتێبی هەیە، لەساڵی ١٣١٣ ك لە دونیا دەرچووە.

## خالد الأزهري:

زانا و زمانناسێکی میسریە، ناوی خالیدی کوڕی عەبدوڵلایە، کتێبی زۆری داناوە کە یەکێکیان لێکدانەوەی پێشەکی (إبن الجزري)، لە ١٤٩٩ ز لە دونیا دەرچووە.

## محمود خليل الحصري:

لە ساڵی ١٩١٧ ز لەدایك بووە، لە ئەزهەر خوێندوویەتی، دواتریش خۆی تەرخان کرد بۆ زانستەکانی قورئان بەهۆی لێهاتووی زۆری لە قورئان و دەنگ خۆشی لە خوێندنەوەیدا، یەکەم کەسە هەموو قورئانی بە دەنگی خۆی تۆمار کردووە بە ڕیوایەتی (حفص) و (ورش) و (قالوُن) و (البزّي)، لە ئاسیاو ئیفریقیا و ئەوروپا و

ئەمریكا و زۆر لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەكان قورئانی خوێندووە و، چەندین كەسیش لە گوێگرانی لەسەر دەستی موسوڵمان بوونە لە ساڵی ١٩٨٠ ز كۆچی دوایی كردووە.

✿✿✿

## پاشکۆی ژمارە (٤)

## وێنەی ئیجازەی نووسەر لە خوێندنی قورئاندا

هذا وقد أجزت الأخ (**إحسان برهان الدين امين**) ان يروي و يقرأ بما تلقاه مني من طريق الشاطبية و التيسير و اوصيه بتقوى الله في السر و العلن و ان لا يتوانى عن تعليم كتاب الله و ان يكون خادما في حياته لكتاب الله تعالى نفعنا الله جميعا بالقرآن الكريم في الدنيا والآخرة وصلى الله على سيدنا محمد و على آله وصحبه وسلم وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.



خادم القرآن

وافد القراء / ابو عبد الله دلير بن احمد

الجامع للقراءات العشر من الشاطبية و الدرة و الطيبة

## پاشكۆی ژمارە (٥)

# اجازة في القراءات السبع

## اجازة الشيخ المقرىء

## أبي عبد الله دلير بن احمد بن محمد الجمور

إلى تلميذه (مُترجم القُرّاء)

احسان برهان الدين امين

اجزت اخي في الله ( مترجم القراء ) [illegible] [illegible]ان الدين امين أن يقرا و يقرىء بما اخذ مني من غير تغيير للمنهج الذي [illegible] الله تعالى لكل خير هذا وقد تمت الختمة المباركة في كلار بعد صلاة العشاء من يوم الجمعة ( ربيع الأول لسنة ١٤٣٣ )

الموافق -٢- ٢٠١٢ ........ آمين



## پاشکۆی ژمارە (٦)

# اجازة بالقراءات الثلاث المتممة للعشر

اجازة الشيخ المقرىء

أبي عبد الله دلير بن احمد بن محمد الجمور

إلى تلميذه (مترجم القرّاء)

احسان برهان الدين امين

أقر و اعترف انا العبد الفقير الى رحمة مولاه دلير احمد محمد الجمور

باني قد اجزت الأخ (مترجم القراء) احسان برهان الدين امين

بان يقرأ و يقرىء بهذه القراءات الثلاث من هذا الأسناد و يجيز من يراه اهلاً لذلك

اقول معترفاً بهذه الأسانيد و صحتها

الفقير الى الله عز وجل المجيز الشيخ المقرىء دلير احمد محمد الجمور

تمت الختمة المباركة في كلار بعد صلاة العشاء من يوم الجمعة ( ربيع الأول لسنة ١٤٣٣ ) الموافق -٢- ٢٠١٢ م

# سەرچاوەكان

١. ابحاث تجويدية / د. ايمن سويد / دار الغوثاني.

٢. الاتقان في علوم القرآن / جلال الدين السيوطي / المكتبة التوفيقية.

٣. الاجابات الواضحات لسؤال القراءات / احمد الحفيان / دار الكتب العلمية.

٤. احكام التجويد و التلاوة /محمود الزلط /مؤسسة قرطبة.

٥. البرهان في تجويد القرآن / محمد الصادق القمحاوي / المكتبة الثقافية.

٦. بسط المقال في شرح تحفة الاطفال / اسامة مراد / دار العالمية للنشر والتوزيع.

٧. التجويد الميسر / د. عبد العزيز القاري / مكتبة الدار بالمدينة المنورة.

٨. التسهيل لقراءات التنزيل / محمد فهد خاروف.

٩. تقريب النشر في القراءات العشر/ محمد بن الجزري / دار الحديث.

١٠. تنبيه القراء الى ماخفي و شاع من الاخطاء / محمد محمود حوا / له ئينتەرنێتەوە.

١١. الجامع في تجويد قراءة القرآن الكريم / كامل المسيري / دار الإيمان.

١٢. دراسات اسلامية معاصرة / انور الجندي.

١٣. الدرر البهية شرح المقدمة الجزرية / اسامة عبد الوهاب / مكتبة الإيمان.

١٤. السعود في قراءة عاصم بن أبي النجود / حامد العاني / ديوان الوقف السنّي.

١٥. الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية / د.غانم قدوري الحمد / معهد الإمام الشاطبي.

١٦. شرح طيبة النشر في القراءات العشر/ محمد بن علي النويري / دار الكتب العلمية.

١٧. شيخ القراء إبن الجزري / د. محمد مطيع الحافظ / دار الفكر.

١٨. علم الوقف و الابتداء في القرآن الكريم واللغة العربية / د. عبد الرزاق الحربي / ديوان الوقف السنّي.

١٩. غاية المريد في علم التجويد / عطية قابل نصر.

٢٠. فتح المجيد في علم التجويد / محمد بن السيد ابراهيم المالكي / دار البشائر.

٢١. القراءات احكامها ومصادرها / د. شعبان محمد إسماعيل / دار السلام.

٢٢. قرة العيون بروايتي شعبة و قالون / محمود محمد ديري / دار القرآن الكريم.

٢٣. كتاب القراءات لأبي عبيد جمع و دراسة الدكتور جاسم الدليمي / الوقف السنّي.

٢٤. اللمعة البدرية شرح متن الجزرية / محمود محمدالعبد / شرح المقدمة الجزرية.

٢٥. المختصر المفيد في جداول التجويد / احمد الطويل / جمعية تحفيظ القرآن.

٢٦. معجم المؤلفين / عمر رضا كحالة / دار إحياء التراث العربي.

٢٧. المنجد في اللغة والأعلام / دار المشرق .

٢٨. المنح الفكرية شرح المقدمة الجزرية / ملا علي القاري / دار السلام.

٢٩. الميسر في علم التجويد / محمد فريد الجمل / مكتبة الإيمان.

٣٠. النشر في القراءات العشر/ محمد بن الجزري / دار الكتب العلمية.

٣١. النور المبين في تجويد القرآن الكريم / محاضرات د. ايمن سويد / تفريغ ميسون دهمان / دار افنان.

٣٢. الواضح في احكام التجويد / د. محمد عصام القضاة / دار النفائس.

✿✿✿

## نووسەر لەچەند دێرێكدا

- لەدایكبووی ساڵی ١٩٧٤ لەشاری دوزخورماتوو.

- قوتابی ماستەرە لە (جامعه أُم دُرمان الاسلامیه) لە سودان/بەشی زمانی عەرەبی.

- دەرچووی كۆلێژی پەروەردەیە بەشی زمانی عەرەبی لەزانكۆی كەركوك.

- دەرچووی پەیمانگای تەكنیكی یە لەشاری كەركوك.

- مۆڵەتی قیرائاتی عەشرەی هەیە لەقورئان خوێندندا لە ڕێگەی (**الشاطبیة**) و (**الدرة**)ەوە.

**تاكو ئێستا ئەم نووسینانەی بە چاپ گەیشتووە:**

١. ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) (٢) بەرگ (نارین) دار المعرفة / بیروت. (وەرگێڕان)

٢. زەكاتی ماڵی بازرگانی چاپی دووەم. (دانان)

٣. ژیاننامەی (عبد العزیز بن عبدالله بن باز). (دانان)

٤. ڕابەری ئەوانەی كە عومرە دەكەن (بەوێنە). (ئامادەكردن)

٥. ڕابەری حاجیان (بەوێنە). (ئامادەكردن) چاپی دووەم.

٦. نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره / كتێبخانەی نارین چاپی بەیروت. (توێژینەوە)

٧. سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە (١مجلد) پرۆژەی تیشك. (وەرگێڕان)

٨. كۆتایی جیهان / نیشانە گەورە و بچوكەكانی قیامەت (بەوێنە) (نارین) دار المعرفة / بیروت (وەرگێڕان).

٩. علماء الاسلام من هم و ماهي صفاتهم / كتێبخانەی تەفسیر (وەرگێڕان بۆ عەرەبی).

١٠. (الجامع الصغیر)ی السیوطي (٣) مجلد بەرگی یەكەمیان بەهاوكاری/ لەژێر چاپدایە (وەگێڕان).

١١. شانۆگەری (زاناو ستەمكار)ی یوسف القرضاوي / لەژێر چاپدایە (وەگێڕان).

١٢. باوەڕ بە ڕۆژی دوایی (نارین) دار المعرفة / بیروت (وەرگێڕان).

- جگە لە چەند كتێبێكی تریش چاپ كراون و هەندێكیان چاوەڕوانی چاپ كردنن.

✿✿✿

# پێڕستی بابەتەكان

بابەت ... لاپەڕە

پێشەكی م. دلێر گەرمیانی ........................................ ٥

پێشەكی د.دیاری أحمد ........................................ ٦

پێشەكی نوسەر ........................................ ٩

كورتەیەك دەربارەی ژیاننامەی (إبن الجزري)........................ ١٦

پێناسەیەك بۆ (المقدمة الجزرية) ................................ ٢٢

دەقی هۆنراوەكە ........................................ ٢٤

بەشەكانی زانستی تەجوید ........................................ ٣٧

بابەتی شوێنی دەرچوونی پیتەكان........................ ٤٢

بەشی یەكەم پیتەكان........................................ ٤٢

بەشی دووەم جێگای دەرچوونی پیتەكان........................ ٤٥

پیتەكانی (الجوف) ........................................ ٤٦

پیتەكانی گەروو........................................ ٤٨

پیتەکانی زمان........................................٥٠
پیتەکانی ناوەڕاستی زمان و مەلاشوو.......................... ٥٣
پیتەکانی سەر زمان................................. ٥٥
پیتەکانی پێشەوەی مەلاشوو............................ ٥٧
پیتەکانی باریکایی زمان.............................. ٥٨
پیتەکانی هەردوو لێو و کەپوو.............................٦٠
سیفەتی پیتەکان ................................ ٦٢
سیفەتە دژ دارەکان .............................. ٦٥
پیتەکانی ئەسپایی و دەنگ بەرزی و توندی و نەرمی...........٦٦
پیتە مامناوەندو بەرزەکان...............................٦٨
پیتە نەرمەکان (الحروف الرخوة).........................٦٩
پیتە نزمەکان (الاحروف الااستفال)..........................٧٢
پیتەکانی لکاندن...................................٧٤
سیفەتە بێ دژەکان...................................٧٧
بابەتی تەجوید.......................................٨٥
پێناسەی تەجوید......................................٨٨
جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان..........................٩١

پایەکانی قورئان خوێندن.................................٩٢
ڕێگەی فێربوونی تەجوید.................................٩٦
بابەتی بچووککردنەوە.................................٩٨
بابەتی پیتی (ر).................................١٠٤
بابەتی گەورەکردنەوە.................................١٠٩
گەورەکردنەوەی پیتەکانی (استعلاء وإطباق).....................١١١
هەندێك ئاگاداری لە مەڕ بەکارهێنانی سیفەتی پیتەکان.............١١٣
بابەتی تێکهەڵکێش کردنی (متماثلین) و (متجانسین) و(متقاربین) و (متباعدین).................................١١٥
بابەتی (ض) و(ظ).................................١٢٠
بابەتی مینگە (غُنَّة) لە هەردوو پیتی (م)و (ن)ی (شدة)داردا..........١٣٠
یاساکانی نونی زەننەدارو تەنوین.................................١٣٤
هەڵگەڕاندنەوەو شاردنەوە (الاقلاب والاخفاء).....................١٣٩
بابەتی مەددەکان.................................١٤٢
بابەتی ڕاوەستانو دەستپێکردن (الوقف والإبتداء)...................١٥٠
پوختەی جۆرەکانی ڕاوەستان.................................١٥٦
باسەکانی پچڕاوو پێککەیشتوو (المقطوع والموصول)...................١٦٧

بابەتی تائەكان.......................................... ١٨٤
بابەتی هەمزەی پێك گەیاندن (همزة الوصل)..................... ١٩١
بابەتی ڕەوم‌و ئیشمام...................................... ١٩٦
سوودی ڕاوەستان بە ڕەوم‌و ئیشمام......................... ١٩٩
پاشكۆی ژمارە (١).......................................... ٢٠٢
پاشكۆی ژمارە (٢).......................................... ٢٠٧
پاشكۆی ژمارە (٣).......................................... ٢١٠
پاشكۆی ژمارە (٤).......................................... ٢١٤
سەرچاوەكان............................................... ٢١٥
نووسەر لە چەند دێڕێكدا................................... ٢١٨
پێرستی بابەتەكان......................................... ٢٢٠